**کتێب:** ڕۆمانی وڵاتی کوێران

**نووسەر:** H.G.Wells

**وەرگێڕان:** شۆڕش غەفووری

**نەخشەسازی ناوەوە و دەرەوە:** شۆڕش غەفووری

**تیراژ:** 500 دانە

**نۆرەی چاپ:** چاپی یەکەم

**چاپخانە:** ڕۆژهەڵات / هەولێر

**شوێنی چاپ:** هەولێر ـ 2012

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی(٢٨٨٥)ی ساڵی ٢٠١٢ پێ دراوە

پێشەکەشە بە:

ـ ئەو چاوانەی کە ڕەش و سپین و دنیا بە ڕەنگی دەبینن.

ـ باوک و دایکم کە زەمەن، تاراوگەنشینی کردن.

ـ یەشتا و سارا

سەنتەری ڕۆشنبیری خەون
پڕۆژەی چاپکردنی کتێب
زنجیرەی - ٤ -
سەرپەرشتیارانی چاپ:
غەمگین بۆڵی
بژار حەکیم
ڕزگار جەباری
ناونیشان: هەولێر - گەڕەکی ڕووناکبیری - نزیک قولکەی زراعە

سپۆنسەری ڕۆمان:
کۆمپانیای (ڕەنگاڕ) بۆ کارکردن لە هەموو بوارە هونەرییەکانی دەنگ و ڕەنگ
www.rengar.com
+9647504491204
+9647704491204

**پێشەکی:**

ئەوەی کە ڕۆمان پێی بەخشیوین، دووبارە پێناسکردنەوەی ژیان و جیهانەکەمانە بە ڕوانگەگەلی جیاواز کە هەر کەسەو دواتر بتوانێت ڕافەی تایبەتی خۆی بۆ بکات. بۆ منیش ڕەنگە هەمان ئەو شتە دروست بێت، کاتێك کە ڕۆمانێکی لەم

چەشنەم خوێندنەوە، هەستێکی سەیر دایگرتم و یەکسەر کەوتمەوە بیری رۆمانی (کوێری)ـی (خۆزێ ساراماگۆ).

زۆرجاران شاعیرانە بیر لەوە دەکەینەوە کە ئەگەر چاوەکانیشمان لە کار بکەون، ئەوە ئیحساس و هەستی دەروونی دەتوانێت دنیامان هەروا لا جوان بکات، بەڵام پرسیارەکە ئەوەیە کە ئاخۆ ئەوکاتیش دەتوانین ئەو جوانییە بە رەنگی ببینین یا جگە لە رەش و سپیەتی هیچی دیکە بەدی ناکەین..

هەر چۆنێك بێت، ئەم رۆمانە هۆکارێکی جدی بوو لای من بۆ ئەوەی دووبارە بیر لە بەها و جەوهەری بینین بکەمەوە و هەر ئەم هۆکارە مەزنەیش بوو کە توانیم وەریگێرمە سەر زمانی کوردی، هەرچەندە ئەگەری ئەوە هەیە من لە هەندێك شوێندا بە هەڵە چوویم لە بەکارهێنانی هەندێك دەستەواژەدا و ئەمەیش رەنگە جەوهەری کاری رۆمانەکە نەگۆڕن هێندەی کە دەچێتە خانەی هەڵەی زمانەوانییەوە.

بەڵام ئەگەر ئەم هەڵانەیش هەبن، ئەوا بێشك نیشانەی لەسەرەتادابوونی کارکردنی منە لەم بوارەدا و هیوادارم خوێنەران بە تازەکاری من لێمی قبوڵ بکەن. لە هەندێك شوێندا نەمویستووە دەقاودەقی وشەکان وەرگێرمە سەر

زمانی کوردی، هێندەی کە هەوڵم داوە واتا و مەفهوومەکان بەو شێوە کە لە کۆمەڵی کوردیدا باون بەکاریان بهێنمەوە.

هەر چۆنێك بێت، ئەم ڕۆمانە بەر لەوەی بۆ خوێنەری وەربگێڕم، کارێکی ئارەزوومەندانە و تێهزرینەرانە بووە بۆ ئەو دەقانەی کە لای من مەزنن. هیوادارم خوێنەرانیش هەست بەو مەزنییەی ئەم دەقە ناوازەیە بکەن.

**شۆڕش غەفووری**
**shorshghafuri@gmail.com**

**بەشێك لە ژیانی ڕۆماننووس:**

(**هێربێرت. جۆرج. وێلز** ـ Herbert George Wells) کە لە ۲۱ی سپتەمبەری ساڵی ۱۸٦٦ی زایینی لە (**برۆملی**) لە دایك بووە و لە ۱۳ی ئوتی ساڵی ۱۹٤٦ی زایینی لە لەندەن کۆچی دوایی کردووە. وێلزی ڕۆژنامەنووس، کۆمەڵناس و مێژوونووس و نووسەری سۆسیالیستی بەریتانی و نووسەری ڕۆمانە زانستی و خەیاڵییەکان، لە کۆتاییەکانی سەدەی هەژدەیەم و سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەیەمدا ژیاوە.

باوکی وێڵز هەژار بوو و دایکیشی خزمەتکار بوونە، هەر بۆیە وێڵز لە چینی خوارەوەی کۆمەڵگە بوو. منداڵی و مێرمنداڵی خۆی لە هەژاری و بەدبەختیدا بە سەر برد، ماوەیەکیش لە دووکانی کوتاڵفرۆشیدا کاری کردوە، بەڵام سەرەڕای هەموو سەختییەکانی ڕۆژگار، بە جدییەکی تەواوەوە درێژەی بە خوێندن و موتالاّ دا.

چووە نێو کۆلێژی پاشایەتی زانستەوە و سوودێکی زۆری لە وانەکانی (**تۆماس هاکسلی** - Thomas Huxley) وەرگرت و عاشقی شێوەی وانەگوتنەوەکەی و ڕێکخستن و لۆجیکەکەی بوو. وێڵز لە ساڵی ١٨٨٨ی زایینی لە زانکۆی لەندەن و لە بەشی زانستدا، توانی بە نمرەی باشەوە بەکالۆریۆسەکەی تەواو بکات و دواتریش کەوتە موتالاّکردن و خوێندنی جوانیناسی. لە ساڵی ١٨٩١ی زایینی لەگەڵ کچە مامەکەیدا (**ئیزابێل مری وێڵز**)، ژیانی هاوسەری پێکهێنا و دوای چوار ساڵ لێی جیا بووەوە و (**ئێمی کاترین ڕابینز**)ی هێنا، ئەو ژنە نووسەرەی کە لە ساڵی ١٩٢٧ کۆچی دوایی کرد و دوو منداڵی لە هەر یەکەیان هەیە.

وێڵز، کاری نووسەری بە نووسین لەمەڕ جوانیناسییەوە دەست پێ کرد و زۆری نەکێشا کە بە هۆی دەستکەوتی

نووسینەکانییەوە ژیانی باشتر و خۆشتر بوو. یەکەمین سەردەمی نووسەری وێلز، کاتی نووسینی چیرۆکە زانستییەکان بوو کە سەرکەوتنێکی گەورەیان بە دەست هێنا و لە ساڵی ١٨٩٥ی زایینی چیرۆکی ماشێنی زەمەنی نووسی و وەك یەکەم ڕۆمانیشی هەژمار دەکرێت کە وەرگێڕدرایە سەر چەندین زمان.

قارەمانی ئەم ڕۆمانە، دەزگایەك دروست دەکا کە دەتوانێت زەمەن بگۆڕێت و ساڵەکان بهێنێتە پێشەوە. هەر بەم دەزگایە چەندین سەفەری دەیان و سەدان ساڵان دەکات و لە ناوچەگەلی جیاواز و ئاو و هەوای گۆڕدراوی جیهانی تێدەپەڕێت. وێلزی لەم بەرهەمەیدا، وەسفی چیرۆك و ڕووداوێکی بێ هەژمار و باوەڕپێنەکراو دەکات و سەرەڕای پێشگۆیی هەجوویەکی سەرمایەدارانە، باسێکیش لە کۆمەڵناسی و تیۆرییە زانستییە بەدەستهاتووەکان دەکات. سەرکەوتنی کتێبەکەی بووە هۆی ئەوەی کە وێلز هەر لە یەکەم هەنگاویدا ڕێگەی خۆی بدۆزێتەوە و لەوە بە دواوە ئەویش هەر وەك (ژۆل ڤێرن) بۆ نووسینی ڕۆمان سوودی لە هەموو سەرچاوە سەرسووڕهێنەرە زانستییەکان وەردەگرت و دەزگاگەلی وەك دەنگهەڵگر، ڕادیۆ، باڵۆن، سەفەری نێوان

گۆیە ئاسمانییەکان و بۆمبی ئەتۆمی بۆ نووسینەکانی بە کار دەهێنا.

چەند چیرۆکی زانستی و خەیاڵی دیکەی زۆر جوانی بە ناوی چیرۆکەکانی ( The Stolen Bacillus and the Other Stories) لە ساڵێ ١٨٩٥ نووسی. پاشان چیرۆکی (**دوورگەی دوکتۆر مۆرۆ** ـ The Island of Dr. Moreau)ی لە ساڵی ١٨٩٦ی زایینی نووسی کە چیرۆکی پیاوێکە بە هۆی نەغرۆبوونی پاپۆڕەکەیەوە دەکەوێتە دوورگەیەکی دوورکەوتە و چاوی دەکەوێت بە بوونەوەرگەلی سەیر و سەمەرە کە ڕەفتار و جووڵەکانیان لە هی مرۆڤ دەچن، بەڵام بە زمانێکی نادیار قسە دەکەن.

چیرۆکی (**پیاوی نادیار** ـ The Invisible man) کە لە ساڵی ١٨٩٧ی زایینی نووسیی، چیرۆکی سەیر و سەمەرەی تێدایە کە وێلز تیایاندا ئیلهامی لە هێزی نوێی زانست وەرگرتووە. ئەم چیرۆکەی باسی گەنجێکی هەژار بەڵام زۆر زیرەك و هۆشمەند دەکات کە دەزگایەکی دروست کردووە هەموو شتێك شەفاف و ناڕوون دەکاتەوە و ئەم تاقیکردنەوەیە لەسەر خۆی تاقی دەکاتەوە و تاقیکردنەوەکەی سەر دەکەوێت، بەڵام لە ناکاو

خۆی بە نادیاری دێتە پێش چاو و بێ خۆراك دەمێنێتەوە و لە سەرما و برسیەتیدا ئازار دەکێشێت.
هەر بۆیە لە ناچاریانِ دەمامکێك دەکاتە سەر ڕووخساری و دەستکێش و جلیش لەبەر خۆی دەکات.
(**شەڕی دنیاکان** ـ The War of the Worlds) کە لە ساڵی ١٨٩٨ی زایینیدا نووسی و لەم ماوەیەیشدا هاڵیود کردییە فیلمێکی زۆر جوان کە تیایدا (تۆم کروز) ڕۆڵ دەگێڕێت، باسی هاتنەخوارەوەی دانیشتوانی مەریخ بۆ سەر زەوی دەکات کە ترس و تۆقینێکی گەورە بە چەکە سەیر و سەمەرەکانیانەوە دروست دەکەن. پاشی ئەم ڕۆمانەیش، ڕۆمانی (**هەوەڵین پیاو لە سەر گۆی مانگ** ـ The First Men in the Moon) لە ساڵی ١٩٠١ی زایینی نووسی.
وێلز کە لە لایەکەوە لە بنەماڵەیەکی هەژار بوو و نادادپەروەرییەکانی کۆمەڵگە تەنگیان پێ هەڵچنیبوو و لە لایەکی دیکەیشەوە دەستی بە فەرهەنگێکی بەربلاو و پەروەردەیەکی زانستی گەورە گەیشتبوو کە دەیتوانی ببێتە هۆی جێگیربوونی سیستەمێکی تەندروست و لۆجیکی لە کۆمەڵگە، وردە وردە حەزی کەوتە سەر پرسە کۆمەلایەتییەکان و خۆی بە چاکسازیکەر و پێغەمبەرێکی

ئیلهامبەخش دەزانی و ئەندێشە ڕیفۆرمخوازانەکانی خۆی لە بەرهەمگەلی جیاوازدا خستنە ڕوو. هەر ئەمە بوو کە وای لێ کرد ڕووبکاتە ڕۆمانگەلی واقیعبینانە و ڕەخنەگرانە و هەجووانە کە تیایاندا دوور کەوتەوە لە دنیای خەیاڵی و بێپەردە کەوتە وەسفکردنی کۆمەڵگە.

ئەو چیرۆکانەی کە لەم کاتەدا نووسینی بریتیبوون لە: (**چیرۆکەکانی فەزا و زەمەن** ـ Tales of Space and Time) لە ساڵی ١٨٩٩، (**عەشق و بەڕێز لویشام** ـ Love and Mr. Lewisham) لە ساڵی ١٩٠٠، (**خۆراکی خوایان** ـ The Food of the Gods) لە ساڵی ١٩٠٤، (**وڵاتی کوێران** ـ The country of the blind)، (**یۆتۆپیای نوێ** ـ Modern Utopia) لە ساڵی ١٩٠٥، (**کیپس** ـ Kipps) لە ساڵی ١٩٠٥، (**تۆنۆ بانگی** ـ Tono-Bungay) لە ساڵی ١٩٠٩، (ئان ڤێرۆنیکا ـ Ann Veronica) لە ساڵی ١٩٠٩، (**ماکیاڤێلی نوێ** ـ The New Machiavelli) لە ساڵی ١٩١١، (**زەواج** ـ Marriage) لە ساڵی ١٩١٢، (**هاوڕێ تووڕەکان** ـ The Passionate Friends) لە ساڵی ١٩١٣، (**بەڕێز بریتلین بە ڕوونی دەبینێت** ـ Mr. Britling Sees It Through) لە ساڵی ١٩١٦، (**چی ڕوودەدات؟** ـ What is Coming?) لە

ساڵی ١٩١٦، (**لە چوارەمین ساڵدا** ـ In the Fourth Year) لە ساڵی ١٩١٨. ویڵز لە ساڵی ١٩١٧ی زایینی، ڕوانگە فەلسەفییەکانی خۆی لە هەردوو ڕۆمانی (**خوا، پاشای نادیار** ـ God, the Invisible King) و (**ڕۆحی ئەسقۆف** ـ The Soul of a Bishop) خستنەڕوو.

هەر لەم ساڵانەدا بوو کە نامەیەکی قاوهەڵسێنی لە ڕۆژنامەی تایمز بڵاو کردەوە کە تیایدا سڵاو و ئافەرینی بۆ شۆڕشی ڕووسیا ناردبوو و بە هۆشیاری ڕۆحی کۆماریی لە جیهاندا هەژمار کردبوو. پاش لەوە لە ساڵی ١٩٢٠ی زایینی چووە ڕوسیا و لە لایەن لنینەوە پێشوازی لێ کرا و لە ساڵی ١٩٢٢ بووە ئەندامی حزبی کرێکارانی بەریتانیا، بەڵام لە بارەی بارودۆخی پیشەسازیکردنی سۆڤیەتەوە کەوتە گومانەوە. لە ساڵانی پاش شەڕ، ویڵز چەندین بەرهەمی لە بارەی ئەندێشە سیاسییەکانی خۆیەوە چاپ و بڵاو کردەوە کە گرنگترینیان (**کورتەی مێژوو** ـ The Outline of History) بوو کە کتێبێك بوو لە بارەی مرۆڤایەتی و مۆچیارییەك بۆ لایەنگری لە بنەمای ئاوەزداری و فەلسەفەی ماددی کە یەکسەر لە لایەن ڕۆحانییەکی گەورەی ئەو کاتەوە بە توندی وەڵام درایەوە.

ویڵز تا کۆتایی تەمەنی هەروا کەوتە دژایەتیکردنی مەزهەب و فکرە نازانستی و نالۆجیکییەکان.

لە کتێبی (پیلانی ئاشکرا ـ The Open Conspiracy) لە ساڵی ١٩٢٨ی زایینیدا، پێشنیاری حکومەتێکی کرد کە لە لایەن پیاوە باڵا و ئاوەزدارەکانەوە بە ڕێوە ببرێت و هەروەها دنیایەك کە مەزهەبەکەی لەسەر بنەمای زانست بنیات نرابێت.

ویڵز، لەو نووسەرە بەرهەمدارانەیە کە دەستی داوەتە باسکردن و شرۆڤەی بابەتی جیاواز. ئەو ڕۆماننوس، مێژوونووس، زیندەوەرناس و ئابوریناس بوو و لە فێرکردنی ئەندێشە نوێیەکانی سەردەمی خۆی سادەکردنەوەی پرسە کۆمەڵایەتییەکان کە خەڵکی سادە لێیان تێ بگەن، تەواو زاڵ بوو، بەڵام نێوبانگییە زۆرەکەی ویڵز زیاتر دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمە زانستییەکەی کە دواتر لە زۆربەی فیلمە سینەماییەکاندا کاریان لەسەر کرا. بەرهەمەکانی دیکەی ویڵز بە هۆی ئەوەی کە بەستراوبوون بە سەردەمێکی تایبەتەوە، بەهای خۆیان لە دەست داوە و تەنیا وەك بەشێك لە مێژوو ماونەتەوە و سەیریان دەکرێت.

ئەم کتێبەیش کە ئێستا لەبەر دەستتاندایە، کتێبێکی ناوازەی ویڵزە کە زۆری خۆش ویستووە و یەکێك بووە لەو کتێبانەی

کە نەیویستووە ئامانج و هزرە نهێنییەکانی نێوی ئاشکرا بکات و ڕاستەوخۆ کەوتووەتە ڕەخنەگرتن لە دنیای بینایی و نابینایی و بەم شێوەیە بە دوو چەمکی بینین و نەبینین باسی خودی مرۆڤایەتی کردووە و هەوڵی داوە دنیا تەنیا لە چاوەکاندا کورت نەکاتەوە و هەر لەم ڕێگەیشەوە ڕەخنە لە خودی سیستەمی باو بگرێت.

## ولاتی کوێـــــران

ولاتی کوێران چیرۆکی سەرزەوینێکە لە نێو زنجیرە کێوەکانی (ئاند) کە لە ناوچەی (**ئیکوادۆر**) هەڵکەوتووە، شوێنێك کە دواتر بە (**ولاتی کوێران**) ناودێر کرا.

وڵاتی کوێران لە شێوەی دۆڵێکی ڕۆچوو بە ناو قووڵایی زەوی هەڵکەوتووە کە لە سێ لاوە بە زنجیرە شاخی سەر دە هەوران کێشراو دەورە دراوە و تەنیا ڕێگەی چوونە ناوەوەی، ڕێگەیەکەی دژواری سەنگەلانە.

لە ساڵیانی زۆر کۆندا، بنەماڵەگەلێك لە خەڵکی بە ڕەچەڵەك جیاوازی (پێرۆ) کە لە زوڵم و زۆری دەسەلاتدار و زۆرداریی ئیسپانییەکان وەتەنگ هاتبوون، پەنایان هێنا بووە ئەم سەرزەوینە دوورە.

ئەم خەڵکانە ساڵیانی ساڵ، دوور لە حەز و ویستی شارنشینی و لە تەنیشت ئەم سرووشتە جوان و سەرنجڕاکێشە و بەهرە سرووشتییە جیاوازەکەیەوە، ژیانیان بەسەر دەبرد تا ئەوەی کە زەویهەژان و بوورکانێك تاقە ڕێگەی هاتوچۆی ئەم دۆڵەی بەست و پەردەیەکی کێشا بە نێو دنیای خەڵك و ژینگەی دەرەوەی، پەردەیەك کە قەت چارەنووس بچووکترین گۆڕانی تێدا نەکرد و لای نەدا.

بەڵام بەر لە ڕوودانی ئەم کارەساتە، تەنیا پیاوێك لە نێو ئەم دۆڵە نەناسراوەدا چانسی چوونە دەرەوە بۆ ڕزگارکردنی دانیشتوانەکەی دەبێت و دەچێتە دەرەوە، پیاوێك کە هیچ کات نەیتوانی بگەڕێتەوە بۆ لای ژن و منداڵ و هاوڕێکانی. ئەو ژیانێکی نەخۆشناسایانەی خۆی لە نێوان خەڵکی ئەوبەری دۆڵەکەدا درێژە پێ دا و لە تەنیایی و غوربەتدا مرد و لە نێو بیرەوەرییەکاندا کاڵ بووەوە، بەڵام بەر لە مردنی، چیرۆکی خۆی بەم شێوەیە گێڕایەوە:

*"ئەو دۆڵە کە دڵی زۆرێك لە خەڵکی لە خۆیدا گلێر کردبووەوە، شوێنێکەیەکی لەبار و دڵنشین، خاوەن ئاوێکی سازگار، هەوایەکی پاك، فەزایەکی لێوڕێژ لە بۆنی گوڵ و نمونەیەکی تەواو بوو لە جوانی و تەرپاراوی سروشت.*

*خاکێکی بە پیت و داپۆشراو بە چەندین دار و گژوگیای جوان. دار کاج و سنۆبەرەکان، دارستانە پڕەکان کە لە داوێنی ئەو کەژە سەر بڵیندانەیان گرتبوو و لە دڵی سرووشتدا بە ئەمانەت دانرابوون، تا جوانییەکانی سەد هێندە کردبێت و لە هەمان کاتیشدا لەمپەر بوون لە*

بەردەم ئەو ڕێووە بەفرە گەورانەی کە ڕووەو خوارەوە شۆڕ دەبوونەوە.
لە سێ لای دۆڵەکەوە، کێوی بەرز و کەندەلانی ترسناك و خەرەندی ستوونیی بەرز کە ڕێگەی هاتووچۆیان تێدا نەبوو، سەریان بە کەڵەکە بەفر و سەهۆڵ داپۆشرا بوو کە شێوەی خێمەیەکیان دەدا کە بەسەر ئاسمانی دۆڵەکەدا هەڵدرابێت. کێوگەلێك کە دەستیان بەرەو ئاسمان بەرز کردبووەوە تا خۆر و ئەستێرەکان دەباوەش بگرن.
هەموو نهێنییەکانی سرووشت دەستیان دە دەستی یەکترییەوە نابوو تا شکۆ و مەزنی ئەم دۆڵە جوانە زیاتر بکەن، دۆڵێك کە لە هەر گۆشەیەکییەوە کانی سازگار هەڵدەقوڵی و بە جیا لە دەشتاییەکاندا ڕۆڵێکی سەرنجڕاکێشیان هەبوو.
خەڵکەکەی بە باشی دەژیان و سوودیان لە بەهرە سروشتییەکانی وەردەگرت. ئەو ئاژەڵە کێوییانەی کە سەرەتا لەگەڵ خۆیاندا هێنابوویانن، بە باشی زاوزێ و گەشەیان دەکرد.
خەڵکی، لە تەنیشت ئەم کێوانەوە کە بە جوانی و پاراوییەوە پاسەوانییان لە دۆڵەکە دەکرد و لە

کارەساتەکان دووریان دەخستەوە، هەستیان بە ئارامی و خۆشییەکی دەروونی دەکرد، لە ماوەی ژیانیان لەم دۆڵەدا، غەمەکانی خۆیان لەبیر کردبوو. دنیاکەیان، خۆشی و سەفایەکی بە قەدوباڵای کێوەکان بەخشیبوو.

بەڵام هۆکاری گەڕانەوەی من لەو بەهەشتە شاراوەیە، بڵاوبوونەوەی نەخۆشی نەزانراوی لاوازبوونی بینایی خەڵکی بوو کە لە ماوەی ئەو ساڵانەدا وردە وردە ڕووخسارە ئەهریمەنییەکەی خۆی نیشان دەدا و هەڕەشەیەك بوو بۆ سەر ئەو منداڵانەی کە تازە لە دایك دەبوون و ئەمە تەنیا نیگەرانییەك بوو کە داوە جاڵجاڵۆکەییەکانی خۆی لەو بەهەشتە سەر زەمینی و دوور لە زوڵمی زۆردارانی ڕۆژگار، زیاتر و زیاتر لە سەر جەستەی خەڵك دەتەنی و خستنیە بیری دۆزینەوەی ڕێگە چارەیەك.

خەڵکی لە دەوری یەکتری کۆبوونەوە و ڕێگەی ڕزگاربوونیان لە قەرەبووکردنەوەی گوناهدا دۆزییەوە، گوناهێك کە لە ئەنجامی نەبوونی پەرستگە و شوێنێکی پیرۆز بۆ پەرەستن تووشی هاتبوون.

*هەر بۆیە بڕیاریان دا بکەونەوە قەرەبووکردنەوەی هەڵەکانیان. چەندی زێڕ و زیو کە پێشتر لەگەڵ خۆیاندا هێنابوویان و بۆ ئەوان لەو دۆڵە دوورکەوتووەدا هیچ سوودێکی نەبوو، کۆکردەوە و وەك نەریتێکی ئەمانەتداری بە منیان سپارد تا شتێکی پیرۆز و بۆ ڕزگاربوون لەو نەخۆشییە پەیدا بکەم و داوای یارمەتی و بەخشین بکەین."*

من، ڕووخساره هەتاوبردووەکەی ئەو پیاوەم کە دڵەڕاوکێ و نیگەرانی هەموو وجوودی داگیر کردبوو بە باشی لەبیره، پیاوێك کە چاوەکانی چرچ و نیوەکوێری بوون.

بەردەوام دەردەدڵەکانی خۆی لە بۆ خەڵکی باس دەکرد و بە دوای دۆزینەوەی کەشیشێك بوو بۆ خەڵکەکەی تا بەر لەوەی ئەو نەخۆشییە پەردەی کوێری بخاتە بەردەم بینایی خەڵکەکە، دەرمانێك بدۆزێتەوە، بەڵام کارەساتی

زەویهەژانەکە ڕێگەی چوونە نێوەوەی دۆڵەکەی لە نێوان کێوە بڵیند و سەر بە ئاسمان چووەکانیدا بەستبوو.

ئەو پیاوە نەوەی پانزەیەمی ئەو مرۆڤانە بوو کە بۆ ئەو دۆڵە جوانە کۆچیان کردبوو.

کەس بە تەواوی درێژەی چیرۆکە تاڵەکەی ژیانی ئەو پیاوەی لە بیر نییە، بەڵام ئەو بێهیوابوونەی دواتر لە گەیاندنی یارمەتی بە دانیشتوانی نێو دۆڵەکە و لە سێبەری غەم و غوربەت و دووری ژن و منداڵ و دۆستەکانی کۆچی دوایی کرد و هێواش هێواش لە بیرەوەرییەکاندا ڕەش بووەوە، بەڵام ئەو چیرۆکەی کە ئەو باسی کردبوو، وردە وردە وەك (ئەفسانەی وڵاتی کوێران) لە نێو خەڵکیدا بڵاو بووەوە و نێوبانگی دەرکرد.

کەچی ژیان لە نێو ئەو دۆڵە بزربووەدا هەر وا درێژەی کێشا و خەڵکی لە چاوەڕوانی گەڕانەوە و دەستکەوتنی هەواڵێك بوون لە پەیکەکەیانەوە، چاوەڕوانییەك کە بە زوویی بووە بێهیوایی و دێوەزمەکەی کوێری هەروا دنیای خەڵکەکەی زیاتر داگیر دەکرد. پیرەپیاوان لە کاتێکدا کە چاوەکانیان ترووکە ترووکیان دەکرد، تلە تل بەم بەر و بەوبەردا دەکەوتن و

لاوەکان حاڵەتێك ـە کوێری و منداڵەکانیش بە کوێری لەدایك دەبون.

ئیتر ژیان لەو دۆڵە جوانەدا، پاراوی و شەوقەی جارانی نەمابوو. دۆڵێك بە خەڵکەکەیەوە لە لایەن دنیای مرۆڤەکانەوە لەبیر کرابوون. نەوە نوێیەکان هەروا لە دایك دەبوون، پانتاییەك کە دێوە تۆقێنەرەکەی کوێری کردبوویە تراتێنگەی خۆی.

ئیتر خەڵکی بە تەواوی بێگانە بوون لەگەڵ دنیای چاو، ڕووناکی و جوانیدا و بە تێپەڕینی ڕۆژەکان لەبیریان دەکرد. گەورەکان گۆچانەکانی خۆیان بە تەقەتەق دەکێشا بە زەویدا و ڕێیان تەی دەکرد و منداڵەکانیان بۆ ئەمبەر و ئەوبەری دۆڵەکە دەبرد تا لەگەڵ ژینگەی کێڵگەکان ئاشنا بن.

بە کورتی، ژیان بە ڕووخسارێکی تەواو نوێیەوە لە چاو جاران و ئەژدادیان درێژەی هەبوو، بەڵام لەگەڵ ئەمەیشدا خەڵکی وەك پێشینانیان، لە ماڵەکانیاندا ئاگریان دەکردەوە و لە لە کاتی سەرمادا سوودیان لە گەرماکەی وەردەگرت، ئەو خانووانەی کە هیچ کات پەنجەرەیەکیان ڕوو بە دەرەوە تێدا نەبوو.

ئەو خەڵکە هەروەك ئەژدادیان بە فەرهەنگ، دابونەریت، هونەر و فەلسەفەی (پێرۆ) ئاشنا بوون و دەست بە دەست و سینە بە سینە دەیانگواستەوە، بەڵام هیچ کات وەك ئەژدادیان وێنایەکیان لە دنیای بینراو نەبوو، جگە لەو دنیایەی کە لە دۆڵەکەدا ژیانیان تێدا بەسەر دەبرد.

کارەکانی ڕۆژانەی ژیان و کشتوکاڵ و هەموو شتێکیان هەر بە هێز و توانای جارانەوە درێژەی هەبوو.

زیاتر لە پانزە نەوە بە سەر ڕۆیشتنی ئەو پیاوەوە تێدەپەڕی کە بۆ دەستکەوتنی یارمەتیی یەزدانی لە دۆڵەکە چووبووە دەرەوە و قەت نەگەڕابووەوە. ئەو پیاوە خۆی نەوەی پانزەیەمینی ئەو مرۆڤانە بوو کە هاتبوونە ئەو دۆڵەوە.

خەڵکی بەم شێوەیە لە دنیایەکی بچووکدا خۆیان زیندانی کردبوو تا ئەوەی کە پیاوێك لە دنیای دەرەوە لە شارە قەرەباڵغ و پڕ لە دانیشتووانەکانەوە چانسی ئەوەی هەبێت ڕێگەی بکەوێتە ئەم دۆڵە لەبیرکراوەوە.

ئەو، شاخەوانێك بوو لە نێزیکی شاری (کیوتێر)، پیاوێکی گەڕۆك و دنیادیتوو، پیاوێکی بوێر کە لە ژیانیدا موتالآیەکی زۆری کردبوو. ئەو لەگەڵ کۆمەڵێك لە شاخەوانە بەریتانییەکاندا ڕوویان لە (ئیکلادۆر) کرد تا جێگەی ڕێنوێن و شارەزایەکی سویسرایی بگرێتەوە کە لە کاتی شاخەوانیدا نەخۆش کەوتبوو.

ناوی ئەو (تۆنیان) بوو.

گرووپە نوێیەکەی شاخەوانەکان ڕێگەی بەرزاییەکانی (ئاند)یان گرتە بەر. ئەندامەکانی گرووپەکە گەیشتنە (پارسکوتۆپیتێل)، ئەو شوێنەی کە تۆنیاز لە دنیای مرۆڤەکان دوور و بزر بوو.

نێزیکی ڕۆژئاوابوون بوو، ئەندامانی گرووپەکە، دیارنەمانی تۆنیازیان پاش ماوەیەکی کورت پێ زانی و دەستیان کرد بە هاوارکردن و گەڕان بە دوایدا، بەڵام شوێنەوارێکیان لێی بەدی نەکرد. خۆریش لەگەڵ تۆنیازدا ئاوا بوو. ئەندامانی گرووپەکە ماندوو و مردوو، لە کاتێکدا بە هۆی سەرمای زۆرەوە خوێن دە ڕەگەکانیان بەستبووی، لە چاوەڕوانی بەیانییەکی ڕووناک پەناگەیەکیان دروست کرد، بەڵام هیچ کامیان تا بەیانی خەو نەچووە چاویانەوە.

بە دەرکەوتنی تیشکە زێڕینەکانی خۆ لەسەر جەستە سپی و شیشەییەکانی بەرزاییەکان، ئەندامانی گرووپەکە دووبارە کەوتنەوە گەڕان و پاش ماوەیەکی کورت، لەو شوێنەی کە تۆنیاز دیار نەمابوو، چاویان بە ئاسەواری ڕنوویەکی گەورە کەوت.

ئەو لەگەڵ ڕەنووە گەورەکەدا کەوتبوو نێو داوێنی دۆڵە ترسناکەکەوە، دۆڵێك کە چاو توانای گەڕان بە نێو قووڵاییەکانیدا نەبوو.

شاخەوانەکان، بۆ ماوەیەك لە لێواری دۆڵەکەدا کەوتنە تێنۆڕین. دارە ئەستوور و بڵێندەکان لە قووڵایی ئەو دۆڵە تۆقێنەرەدا وەك قولانج و گیای تازەڕواوەکان دەبینران، ئەویَ وڵاتی ونبوو و ئەفسانەی کوێرەکان بوو، بەڵام ئەندامانی گرووپەکە تەنانەت بینینیان لە چوونەخوارەوە لە داوێنە مەزن و ستوونییەکانی ئەو دۆڵە عاجز و بێهێز بوو. هەر بۆیە بۆ بزربوونی نۆنیاز غەم دایگرتن، داخدارییەك لە ناخی دڵەوە، پاش ماوەیەکی کورت درێژەیان بە ڕێگەی خۆیان دا.

بەڵام ئەو پیاوەی کە کەوتبووە قووڵاییەکانی ئەو دۆڵە ترسناکەوە، زیندوو مابووەوە.

نۆنیاز، لە بەرزی هەزاران پێوە کەوتبووە سەر ڕەنووە مەزنەکە. ئەم کێوە مەزنە بەفرە، پاش شۆڕبوونەوە بۆ نێو داوێنی دۆڵەکە، لەو شوێنەی کە ژمارەیەکی زۆر داری کاج و سنۆبەری هەبوو، گلێر ببووەوە و نۆنیازیش لە نێو کلووە بەفرەکاندا بێهۆش کەوتبوو، بەڵام نەرمی بەفرەکە هۆکارێك بوو بۆ ئەوەی ئێسقانەکانی نەشکێن.

نۆنیاز وردەوردە ڕۆح دە جەستە نیوەگیانەکەیەوە زا، هەستی بە نەخۆشییەکی توند و سڕبوون لە نێو جێگەدا دەکرد تا ئەوەی کە پاش کەمێك هەستی دەبەر خۆی هاتەوە و تێگەیشت کە چی بەسەر هاتووە. بەسەرهاتی شاخەوانی و کەوتنەخوارەوەکەی وەك خەونێك دە مێشکیدا دەهات و دەچوو.

ڕۆژ تێپەڕیبوو و نۆنیازیش بە سەرسووڕماوانەوە چاوی بڕیبووە ئەو ئەستێرانەی کە چاوقرتێیان لەگەڵیدا دەکرد و مژدەی ژیانێکی نوێیان دەدایێ. هێشتا بە تەواوی نەیدەزانی بۆ کوێ و چلۆن هاتووە.

بە دەستە لەرزۆکەکانی کەوتە کونجکۆڵی جەستەی، لە هەموو جەستەیدا هەستی بە ئازارێکی زۆر دەکرد. جلەکانی وەك گلێمێك بە جەستیەوە ئالابوون و قۆپچەکانی پچڕابوون.

لە ژێر ڕووناکی هەیڤدا، تارومارانە چاوی دە جەستەی بڕی. سەیری هەڵدێرگە و دیوارە ترسناك و بەرزەکانی دەوروبەری خۆی کرد. وەك بڵەی لە زیندوومانەوەی خۆی تەواو سەری سووڕماوە. لە تاوی ئازار و ترس، بوێری دەستوەردانی نەبوو لەو مەلافە پەشمینە سپییەی کە تێی ئالابوو.

دەمێ بە هێواشی تێپەڕی، وردە وردە ڕووناکی بەرەبەیان دەرکەوت و تاریکی نێو سپیدەدەمەکەی بزر کرد.

نۆنیاز، بە زەحمەت لە شوێنی خۆی هەستا و بە حەزێکی زۆرەوە، لە کاتێکدا کە هەموو جەستەی لە تاوی ئازارەکەی تێکشکابوو، خۆی بردە سەر ڕێگەیەی سەرەوژێری دۆڵەکە و لە شوێنێك و نێزیك کانییەکدا ئاوی سازگاری خواردەوە و لە داوێنی ڕووناکی گەرمی خۆر و ئاوازی ئەو باڵندانەی کە بەر گوێی دەکەوت، خەوێکی قووڵی لێ کەوت.

پاش ماوەیەکی کورت، لە خەوی شیرین هەستا و بە سەرنجێکی زۆرترەوە دە دەورووبەری خۆی نواڕی. چوار دەوری بە بە کەڵەشاخ و هەڵدێرگەی ستوونی و سەردە ئاسمان چوو دەورە درابوو. لەوێ دۆڵێك هەبوو، دۆڵێکی نادیار لە قووڵایی زەوییەوە کە دیمەنێکی زۆر جوان و سەرنجڕاکێشی هەبوو..

هەموو شوێنێکی سەوز و تەڕ، ئاوازی ئەفسووناوی باڵندەکان و کانیگەلی سازگاری زۆر و جوان.

بەڵام لە ناکاو شتێکی دیکە سەرنجی نۆنیازی بۆ لای خۆی ڕاکێشا، ئەو پارچە بەردانەی کە وەك هێشووی ڕێکخراو لە خوارەوەی دۆڵەکە لەسەر یەك هەڵچنرابوون، وەها پێدەچوو

مرۆڤ دەستی لە دروستکردنیاندا هەبووبێت. نۆنیاز، تەکانێکی دەخۆی دا، لە کاتێکدا کە وەك مار خۆی دە تەختەبەردەکان هەڵدەسوو، لە داوێنی کێوەکەوە ڕووەو خوارەوە و بەرەو ئەو دۆڵە نهێناوییە کەوتە ڕێ.

ئەو هەروا هەوڵی دەدا، ڕووناکی خۆر دووبارە کەمڕەنگتر و کەمڕەنگتر دەبووەوە، ئاوازی باڵندەکان کزتر دەبوون و بە خێرایی تاریکی هەموو شوێنێکی دەتەنی.

نۆنیاز لە داوێنی تاشە بەردێك دانیشت و بە وردی سەیری نێو قووڵایی دۆڵەکەی کرد. وا پێدەچوو کە بڵێسەی چەندین ڕووناکی لەڕووچوو لە پشتی بەردەکانەوە چاوترووکانییان دەکرد. ئەو بەردانەی کە لە دوورەوە لە هێشووی گەنم دەچوون. نۆنیاز چەند لاسەکە گەڵایەکی بنەگیایەکی لێ کردەوە و دەستی کرد بە جووینیان تا کەمتر هەست بە برسیەتی بکات.

نۆنیاز، لە بەرەبەری نیوەڕۆی ڕۆژی دواتر توانی خۆی بگەیەنێتە خوارەوەی دۆڵەکە، زۆر برسی و ماندوو بوو. لە گۆشەیەکدا دانیشت و هەندێك ئاوی خواردەوە و لە کاتێکدا کە بە کونجکۆڵییەکی زۆرەوە دەینۆڕی، تا دەهات سەرنجڕاکێشییەکەی زیاتر دەبوو.

کشتوکاڵێکی تەڕوبڕ بە شێوەیەکی تایبەت، زۆرترین پانتایی دۆڵەکەی داپۆشیبوو و بە گوڵی جوان ڕازابووەوە. کێڵگەیەك کە بە دەستی مرۆڤ بەرهەم هاتبوون و بە شێوەیەکی ڕێکخراو ئاودێری دەکران.

ڕەوتی ساف و زووڵاڵی ئاوی سەرچاوەکانی داوێنی کێوەکانی دەوروبەر، لە دۆڵەکەدا بەیەك دەگەیشتن و وەك ڕووبارێکی لێهاتبوو. ئەمانە نیشانەیەك بوون لە ژیانی خەڵکێکی شارستانی، لەم گۆشە دوورکەوتە و لەبیرکراوەی دنیا.دیمەنی شەقامەکان زۆر ڕێکوپێك و هەردوو لایان بە بەردگەلی ڕەسیفئاسا جیا کرابوونەوە.

خانووەکانی نێوەڕاست گوندەکە، بە پێچەوانەی سیستەمی نارێکی داوێنکێوەکان، لە سەرەتای هێڵی ڕێکوپێك بە هەردوو لای شەقامەکە سەرەکییەکەوە و بە وردبینییەکی تەواوەوە بنیات نرابوون، بەڵام لە تەنیشت ئەو هەموو ڕێکوپێکییە زاڵەی نێو دۆڵەکە، ڕەنگی دەرگا و خانووەکان تەواو نارێك بوون.

هەندێکیان ڕەنگ کرابوون و هەندێکی دیکەیشیان بێ ڕەنگ مابوونەوە. ڕەنگی خۆڵەمێشی، خورمایی، ڕەش، سپی و

قاوەیی بە شێوەیەکی بەربڵاو و ناڕێك لەسەر خانووەکانی گوندەکە ڕەنگی دەدایەوە.

دیمەنی ڕەنگەکان، بۆ یەکەم جار وشەی (کوێری) لە زەینی نۆنیازدا بەرهەڤ کرد و بە خۆی گوت:

**"ئەو کەسانەی کە ئەمانەیان دروست و ڕەنگرێژ کردووە، دەبێت وەك شەمشەمەکوێرە کوێر بن."**

نۆنیاز بە هەنگاوی هێواش و چاوی کراوەوە، بەرەو گوندەکە کەوتەڕێ. لە نێزیك تاڤگەیەکی بچکۆلانەدا وەستا، بە ئاسانی دەیتوانی هەندێك پیاو و ژن ببینێت کە لە کێڵگەکەدا بوون.

لە لایەکی دیکەوە، هەندێك منداڵی چکۆڵە دەبینران. لە نێزیکیەوە سێ پیاو خەریکی گواستنەوەی ئەو مەشکەئاوانە بوون کە بەسەر پشتیانەوە بەرەو ماڵەوە دەیانبردنەوە. وا پێدەچوو ئەو مەشکانەیان لە پێستی حوشتر دروست کردبێت.

نۆنیاز بە بینینی ئەو سێ پیاوە، لە کاتێکدا کە بە جوانی هەستی بە دەنگی ترپەی دڵی خۆی دەکرد، لە پشت

تاشەبەردێکی گەورە خۆی شاردەوە، بەڵام چاوی لەسەریان هەڵنەدەگرت.

ئەو سێ پیاوە لە کاتێکدا کە بە دوای یەکەوە دەڕۆیشتن، ورتە ورتێکیشان لەگەڵ خۆیاندا دەکرد. ڕەفتاریان وەها بەڕێزانە و قورس بوو کە نۆنیاز بوێری ئەوەی دایە خۆی تا لە پشت تاشە بەردەکەوە بێتە دەرێ. لە پشتیانەوە وەستا و بانگی کردن، دەنگێك کە لە هەموو دۆڵەکەدا دەنگی دایەوە.

لە ناکاو، هەر سێ پیاوەکە وەستان و سەریان بەمبەرو بەوبەردا وەرسووڕاند، وەك ئەوەی کە بە وردی سەیری هەموو لایەکیان دەکرد و بە دوای خاوەنی دەنگەکەوە بوون.

بارودۆخێکی تێکەڵاو لە ترس و سەرسووڕمان لە ڕووخسارياندا بەدی دەکرا. نۆنیاز دەستی بڵیند کردبووەوە و ڕای دەوەشاند تا بەشکوم ببینن، بەڵام وەها پێدەچوو سەرنجیان نەدەدایە ئاماژەکەی ئەو.

لەگەڵ خۆیاندا شتێکیان وت، وەك ئەوەی کە وەڵامی ئەویان دابێتەوە و دووبارە دەستیان کردەوە بە ڕۆیشت.

دیسان نۆنیاز هاواری کرد و بە دەست ئاماژەی بۆ کردن، بەڵام دووبارە کاریگەری نەبوو و پاش وەستانێکی کورت

درێژەیان بە ڕێگەی خۆیان دایەوە. بۆ دووەمین جار وشەی (کوێری) لە زەینی نۆنیاز وێنای بەست و بە خۆی گوت:

**"گەمژانە ڕەنگە کوێر بن، گەمژانە ڕەنگە کوێر بن."**

پاش ئەو هەموو هاوار و ئاماژەیە، لەوە دڵنیا ببوو کە ئەوان دەبێت کوێر بن، چونکە بە خێرایی لە کاتێکدا کە برسیەتی و ماندووبوون لە پێی خستبوو، بە شەقە شەق خۆی گەیاندە لایان، ئیتر هیچ جێگەی گومان نەمابووەوە کە ئێرە هەمان وڵاتی کوێرانە کە چەندین ساڵ پێشتر لە ئەفسانەکاندا ناوی هاتبوو، ئەفسانەیەك کە نهۆ بۆ ئەو وە ڕاست گەڕابوو.

نۆنیاز، هەستی بە شەهامەت و ئازابیەکی گەورە لە بوونی خۆیدا کرد. بوێرییەکی زیاتری دایە خۆی، چونکە ئەو تەنیا چاوساغی ئەم وڵاتی کوێرانە بوو و بە شادی و دڵخۆشییەکی تایبەتەوە ورتە ورتی لەگەڵ خۆیدا دەکرد:

**"لە وڵاتی کوێران، لە وڵاتی کوێران، پیاوێکی یەك چاویش پاشایە."**

ئەو سێ پیاوە بە گەیشتنی نۆنیاز، لە تەنیشت یەکترییەوە وەستان، سەیریان نەدەکرد، بەڵام گوێیەکانی خۆیان بەرەو ئەو قۆڵاخ کردبوو تا دەنگەکەی باشتر ببیستن.

ئەو سێ پیاوە لە هەمان ساتی یەکەمدا بە باشی بۆیان دەرکەوتبوو کە دەنگی پێی غەریبێکە، دەنگی پێیەك کە بۆ یەکەم جار دەیانبیست.

**"بەڵام ئەم غەریبەیە لە کوێوە هاتووە؟!"**

کەمێك هەراسان دەکەوتنە بەر چاو. نۆنیاز لە ژێر ڕووناکی هەیڤەوە بە باشی دەیبینی کە چۆن چاوەکانیان نووقاوە و وەك تۆپێکی فسەوبوو ڕۆچووبوون بە قووڵدا.

یەکێك لە کوێرەکان بێدەنگییە قورسەکەی شکاند و دەنگی هەڵبڕی و گوتی:

**"پیاوێك، دەنگی پیاوێك!"**

بە بیستنی ئەم وشە کورتانە، نۆنیاز بۆی دەرکەوت کە بە زمانی ئیسپانی قسە دەکەن.

ئەو پیاوە درێژەی دایێ:

**"ئەو، ئەو.. پیاوێکە و ڕەنگە ڕۆحێك بێت کە لە نێو کێوەکانەوە هاتبێتە دەرەوە."**

نۆنیاز لە کاتێکدا کە بە هێواشی و هۆشدارییەوە لێیان نێزیك دەبووەوە، یەکهۆ هەموو وردەکارییەکانی ئەفسانەی وڵاتی

کوێرانی وەک تیشکێک بە زەیندا تێپەڕی و دووبارە بە خۆی گوتەوە:

**"لە وڵاتی کوێران، بەڵێ لە وڵاتی کوێران پیاوێکی یەک چاویش پاشایە."**

نۆنیاز لە کاتێکدا کە بە وردبینییەوە سەیری قەدوباڵای ئەو سێ پیاوەی دەکرد، بەڕێزانە سڵاوی لێ کردن و لەگەڵیاندا کەوتە قسە. یەکێک لە کوێرەکان گوتی:

**"براکەم (پێدرۆ)، ئەم پیاوە.. ئەم پیاوە لە کوێوە هاتووە؟!"**

**"لە سەرووی کێوەکانەوە هاتووم، لەو دوور دوورانەوە، لە شوێنێک لە دەرەوەی وڵاتەکەی ئێوە، لە شوێنێک کە مرۆڤەکان دەتوانن ببینن، لە شوێنێک لە نێزیک شاری بوگۆتا، شوێنێک کە هەزاران مرۆڤی لێ دەژین. ئەو شوێنەی کە شاری هێندە گەورە هەن کە چاو ناتوانێت هەمووی ببینێت."**

پێدرۆ وەڵامی دایەوە:

**"مرۆڤەکان دەتوانن ببینن؟!"**

و دووەمیشیان درێژەی دایێ:

**"لەوبەری کێوەکانەوە، شوێنێك کە..؟!"**

و لە ناکاو ئەو سێ پیاوە دەستەکانی خۆیان تەواو کردەوە. وەك ئەوەی کە گەرەکیان بێت باڵندەیەك بگرن بەر لەوەی کە بیر لە فڕین بکاتەوە. هێواش بەرەو لای نۆنیاز چوونە پێشەوە و ئەویش بە هەمان هێواشی بەرەو دواوە دەکشایەوە. یەکێك لە کوێرەکان گوتی:

**"وەرە بەستەزمان، وەرە ڕامەکە."**

و دواتر بە گوێهەڵخستن بۆ هەنگاوەکانی نۆنیاز، یەکسەر بە هەنگاوی گەورەوە خۆیان گەیاندێ و وەك هەڵۆی برسی گرتیان. بە وەسواسییەوە دەستیان بە هەموو جەستەیدا دەهێنا. سەرسووڕمانییەکی تایبەت هەموو وجوودیانی داگیر کردبوو. تێدەهزرین، بەڵام ئەویش هەر وەك خۆیان مرۆڤێك بوو، بەڵام لە کوێ، بەڕاستی ئەو لە کوێوە هاتبوو..

لە ناکاودا نۆنیاز هاواری کرد:

**"هێواش، ئاگادار، پەنجە نەکەیت بە چاومدا."**

و لە کاتێکدا کە بە وەسواسییەوە پەنجەیان بە چاویدا دەهێنا، پێدرۆ گوتی:

**"مەخلوقێکی سەیرە، سەیری قژی بکە وەك مووی حوشترە."**

و (کوریا) درێژەی دایێ:

**"هەر وەك ئەوەی کە کێوەکان هێنابێتیانە دنیاوە، سفت و زبرە."**

و سێیەمیان گوتی:

**"ئەو قسە دەکات، دەبێت مرۆڤ بێت، مرۆڤ."**

پێدرۆ ڕوو لە نۆنیاز گوتی:

**"ئەها، کەوایە تۆ تازە لەدایك بووی؟!"**

نۆنیاز کە تەواو سەری لێ شێوابوو، گوتی:

**"ڕێك لە سەرووی ئەو.. ئەو کێوانەوە، ئەو شـ.. شاخانە، لە.. لە دنیایەکی.. گەورە، بە قەدرا، بە قەدرا دوانزە ڕۆژی سـ.. سەفەری دەریایی هاتووم."**

کوێرەکان زۆر کەم گوێیان دەدایە قسەکانی نۆنیاز.

ئەو قسانەی کە هیچ واتایەکیان بۆ ئەوان نەبوو. کوریا هەوڵی دەدا ئەم دیاردەیە بە شێوەیەکی زانستی و لۆجیکی شرۆڤە بکات:

**"ئەها، باوکەکانمان گوتبوویان کە کێوەکان جاری وا هەیە دەزێن و زۆربەی ئەو کاتانەی کە هەوا تەپرە دەزێن."**

پێدرۆ بە شێوازێکی بیرمەندانەوە گوتی:

**"دەبێت بیبەینە لای پێشەوا و سەرۆکەکەمان."**

و کوریا هاواری کرد:

**"سەرەتا دەبێت جاڕ لێدەین، دەنا منداڵەکان دەترسێن، چونکە ئەمە مەخلووقێکی سەیرە."**

کوێرەکان هەر وا کە نۆنیازیان وەك نێچیرێکی ڕاو لە نێو دەستان گرتبوو، دەستیان کرد بە جاڕ هەڵدان و بە ڕاکێش ڕاکێش لەگەڵ خۆیاندا دەیانبردە پێشەوە.

نۆنیاز وەك ڕەخنەیەك لە بەرامبەر ڕەفتارەکەیاندا، گوتی:

**"بەلام.. بەلام من دەتوانم ببینم، من، من چاوم هەیە."**

یەکێك لە کوێرەکان گوتی:

**"بینین؟!"**

و بە شێوازێکی گاڵتەجاڕانەوە درێژەی دایێ:

**"بەڵێ، بەڵێ تۆ دەتوانی ببینی!!"**

لە کاتێکدا کە نۆنیاز کەمێك تووڕە پێدەچوو، گوتی:

**"بەڵێ، من دەتوانم ببینم."**

کوریا بۆ هاوڕاکانی خۆی باس کرد:

**"ئەو تازە لەدایك بووە، هێشتا مێشکی لەسەر خۆی نییە و هەر لەبەر ئەوەیشە قسەی لابەلا دەکات. دەبێت لەگەڵ خۆماندا هەر بەم شێوەیە بیبەین."**

نۆنیاز بیری کردەوە..

**"دواجار لە کاتێکی لەباردا، سەبارت بە جیهانی ڕاستین وەئاگایان دەهێنم، پێیان دەڵێم چەندە دنیایەکی جوان و سەرسووڕهێنەر لە دەورووبەریاندا هەیە، لەبارەی شارە گەورە و بچووکەکان و هەموو شتێکەوە قسەیان بۆ دەکەم."**

**هەر وا کە دەیانبردە پێشەوە، نۆنیاز دەیبینی کە چلۆن خەڵکی بە هاوار و ڕاکردنەوە، لە نێوەڕاستی گونددا**

کۆدەبنەوە و بێئۆقرەییانە هەواڵی لەدایکبوونی منداڵێك لە کێوەکانەوە بە یەکتری دەدەن.

هەر بەو شێوەیەی کە لێك نێزیك دەبوونەوە، هەروا گوندەکە گەورەتر و گەورەتر دەردەکەوت و ڕەنگە تێکەڵاو و سەیرەکان زیاتر سەرنجیان ڕادەکێشا.

که گەیشتنە نێو گۆڕەپانەکەوە، هەموو خەڵکی بە پیر و لاو و ژن و پیاو و منداڵەوە وەك گێژەلووکە بە دەوریدا هەڵدەسووڕان، پچەپچیان دەکرد، بۆنیان دەکرد و جارجارەیش گوێیان لە قسەکانی دەگرت.

وەها پێدەچوو کە کاروباری تاجلەسەردانانەکەی لە وڵاتی کوێران خەریکە هەموار دەبێت و تۆنیاز بە حەز و گەرموگوڕییەکی تایبەتەوە لە نێوان خەڵکیدا لەبارەی دەرەوەی دنیای ئەوان و لە هەموو شوێنێك و هەموو شتێك قسەی بۆیان دەکرد.

هەندێك لە ژن و منداڵەکان وردە وردە لە دەوری دوور کەوتنەوە، چونکە دەنگی لە دەنگە خەڵکی گوندەکە تووڕەترانە بەر گوێ دەکەوت. ئەو سێ پیاوەی کە سەرەتا گرتبوویان، بە جووڵەکانی خۆیان وەهایان نیشان دەدا کە

تەنیا ئەوان خاوەنی تەواوی ئەون و ئەوان دۆزیویانەتەوە و بەردەوام دووبارەیان دەکردەوە:

**"پیاوێکی کێوی و لەدایکبووی کێوەکان"**

پێدرۆ لە کاتێکدا کە ڕووی لە نۆنیاز کردبوو، گوتی:

**"ئەی بوگۆتا، پیاوێکی سەیر قسەی سەیر دەکات، گوێت لێ بوو چیم گوت بوگۆتا؟!"**

دواتر ڕووی لە خەڵکەکە کرد و گوتی:

**"هێشتا مێشکی جێ نەکەتووە. تازە لەدایك بووە.. تازە زمانی کردووەتەوە."**

کوڕۆژگەیەك قولانجێکی توندی لە دەستی نۆنیاز گرت و بە گاڵتەوە گوتی:

**"ئۆی بوگۆتا"**

و نۆنیاز، بەڵێ ئەو، هەروا بە گەرموگوڕی هەوڵی دەدا..

**"من لە دنیایەکی گەورەترەوە بۆ ئێرە هاتووم، شوێنێك کە مرۆڤەکان دەتوانن ببینن، شوێنێك کە.."**

**"بەڵێ، تۆ لە بوگۆتاوە هاتووی، تۆ لە شارە گەورەکانەوە هاتووی، تۆ.."**

دواتر خەڵکی هەروا چۆن دە نێوان خۆیاندا گەمارۆیان دابوو، بردیانە لای دیوەخانی گەورەی گوند، شوێنێك کە وەك هەموو خانووەکانی دیکە تاریك و هیچ پەنجەرەیەکی ڕووە دەرەوە تێدا نەبوو. تاریکی تاریك، وەك شەوە ئەنگوستەچاوی بێ ئەستێرە.
خەڵکی بە گەیشتنە ماڵی پێشەواکەیان، نۆنیازیان وەك نێچیرێکی لاواز لە خزمەتیدا خستە سەر زەوی و بە دەوریدا گلێر بوونەوە و نۆنیازیش دووبارە دەستی کردەوە بە هەوڵەکانی خۆی و هیوادار بوو پێشەوای گەورە کە پیاوێکی ئاقڵ و گەورە بوو، لە قسەکانی تێ بگات.
**"من لە دنیایەکی گەورەوە هاتووم، لە شارە قەرەباڵغەکانەوە، کێوەکان منیان نەخستووەتەوە، من..."**

قسەکانی نۆنیازیش هیچ واتا و مانایەکیان بۆ پێشەوای گەورە نەبوو.

دەنگی کوریا لە نێو ئاپۆرەی خەڵکەکەوە بەر گوێ کەوت:

**"ئەو تازە لە دایك بووە، کێوەکان هێناویانەتە دنیاوە، هێشتا قسەی لابەلا دەکات، هێشتا بە تەواوی زمانی نەکراوەتەوە."**

و هەر کەسەو شتێکی دەگوت، تۆنیاز کە لە برسان و ماندووبوونان هیلاك و گیانەلا بوو، هەر بەو شێوەی کە لە نێوان خەڵکەکەدا کەوتبوو، هاواری کرد:

**"ئایا دەتوانم دانیشم؟ من لەگەڵ ئێوە مشتومڕ ناکەم."**

خەڵکی پاش ڕاوێژێکی کورت، ئیزنی دانیشتنیان پێ دا. دەنگی پیاوێکی پیر کە هەمان پیشەوا یا کوێخای گەورەی گوند بوو، بێدەنگییەکی لە نێوان خەڵکەکەدا دروست کرد.

ئەویش هیچ لە قسەکانی تۆنیاز تێنەگەیشتبوو و تۆنیاز ئەم جارەیان بەو پەڕی وردبینی و سادەییەوە، باسی دنیا گەورەکەی دەورووبەریانی کرد.

دنیایەك کە ئەو لەوێوەوە کەوتووەتە نێو ئەم دۆڵەوە، دنیایەك کە تیایدا ئازاد بوو، باسی ئاسمانی کرد، ئەستێرەکان، کێوەکان، کانییەکان و جوانییەکان.. ـی کرد، بەڵام دەرەنجامەکەی هەر وەك جاران بوو.

کوێخا کە پیاوێکی بیرمەند و گەورە بوو و خەڵکەکە ڕێزێکی زۆریان لێ دەگرت، تەواو چووبووە نێو بیرکردنەوەی خۆیەوە کە دەبێت چۆن چۆنی هیدایەت و ڕێنوێنی ئەم پیاوە تازە لەدایکبووەی نێو دڵی کێوەکان بکات.

پاش ماوەیەکی کورت، کە چاوەڕوانییەکی دژوار بوو بۆ تۆنیاز، دەستی کرد بە قسان و لەگەڵ تۆنیازدا کەوتە قسەکردن لەبارەی حەقیقەتی ژیان، فەلسەفە، مەزهەب و زۆر بابەتی دیکە و ئەوەی کە دنیای ئەوان چۆن لە نێو بەردەکانەوە پەیدا بووە و حوشتر و هێسترەکان چۆن دروست بوونە، چۆنیەتی دروستبوون و کامڵبوونی مرۆڤ، چۆنیەتی خولقاندنی فریشتەکان کە ئەوان گوێیان لە دەنگیان دەبوو و چێژیان لێ دەبرد (*بە هەمان دەنگی ئەو باڵندانەیان دەگوت*)، چۆنیەتی دابەشبوونی زەمەنی نێوان سەرما و گەرما (*سەرما هەمان شەو و گەرمایش هەمان ڕۆش بوو*) و ئەوەی کە لە کاتی گەرمادا خەڵکی دەخەون و پشوو دەدەن و لە کاتی سەرمادا کار و هەوڵ دەدەن.

لە کۆتاییدا، کوێخاوی گەورە داوای لە تۆنیاز کرد کە دەبێت سوود لە ئەزموون و هزری کەسانی دیکە وەرگرێت و هەر چی

زووە ڕاستییەکان بزانێت و خەڵکیش بە ڕازیبوون و ملکەچی تەواوەوە، پشتگیری قسەکانی کوێخایان کرد.
تیشکی زێڕینی خۆر، وردە وردە لە دیوارە بەرزەکانی کێوەکانی دەورروبەرەوە ڕووەو خوارەوە شۆڕ دەبووەوە و ڕۆژ بووەوە و خەڵکی دەبوو بە پێی نەریتی خۆیان پشوو بدەن. لە نۆنیازیان پرسی:
**"نهۆ کاتی پشووە، ئایا خەوتن دەزانی؟"**

و ئەو کە بە هۆی ماندووبوون و برسیەتییەوە بەلادا هاتبوو، بە دەنگێکی پچرپچڕەوە وەڵامی دایەوە:
**"بـ.. بەڵێ.. من خەوتن دەزانم."**

بەڵام بەر لەوە داوای هەندێك خواردنی کرد.
دواجار کاتێ کە خەڵکی هانی نۆنیازیان دەدا تا بیر لە داواکانی گەورەی گوندەکەیان بکاتەوە، هەندێك نان و شیری حوشتریان لە قاپێکی گڵێنەوە بۆ هێنا و داوایان لێی کرد تا کاتی کارکردن، پشوو بدات.
هەر چەندە کە نۆنیاز زۆر ماندوو بوو، بەڵام تۆزقاڵێکیش خەو نەچووە چاوەکانییەوە.

دانیشت و کەوتە بیرکردنەوە لە چارەنووسی خۆی لە نێو ئەو دۆڵەی کە هیچ کات پێشتر تەنانەت ئەفسانەی وڵاتی کوێرانیشی بە خەیاڵدا نەهاتبوو، ئەفسانەیەك کە ئیتر ئێستا ڕەنگ و بۆی ڕاستی بە خۆیەوە گرتبوو.

نۆنیاز لە خەڵوەت و تەنیایی خۆیدا هەندێك جار پێدەکەنی، پێکەنینێك کە دەستلەملانی تووڕەیی و سەرسووڕمان بوو و لەگەڵ خۆیدا ورتە ورتی دەکرد.

**"کەللەپووچەکان.. کەللەپووچەکان، بەڵام لێگەڕێ.. هەر چۆنێك بێت ئەوان نەوە لە دوای نەوە نابینا بوونە، من بە هەوڵ و ماندووبوون دەتوانم و دەبێت بتوانم بیانهێنمە سەر ڕێی ڕاست، دەبێت بیر بکەمەوە، دەبێت بیر بکەمەوە."**

و هەر وا کە ڕۆچووبووە نێو بیرکردنەوەکانی خۆیەوە، خۆر هێور هێور لە پشتی کێوە بەرزەکانەوە بزر بوو و کاتی کار و چالاکی و هەوڵدانی خەڵکەکەیش دەستی پێ کرد.

دەنگێك لە دوورەوە بەر گوێ دەکەوت کە داوای نۆنیازی دەکرد.

**"هەی بوگۆتا وەرە ئێرە."**

و نۆنیاز کە لە سووچێکی ژوورەکە دانیشتبوو، بە بیستنی دەنگەکە کەوتە بیری شتێکەوە:
بە هیواشی لە شوێنی خۆی هەستا، دەیتوانی گوێی لە دەنگی ترپەی دڵی بێت.
هەر وەك مێروولەیەك بە هێواشی و بە ئەسپاییەوە کەوتە جووڵە، لە ژوورەکە هاتە دەرەوە و چووە نێو شەقامەکەوە.
دووبارە دەنگەکە لە دوورەوە بیسترایەوە.
**"هەی، بوگۆتا، مەجووڵێ."**

و نۆنیاز پێکەنینێکی هاتێ، پێکەنینێك کە هیچ دەنگی نەبوو.
بە هێواشی چووە سەر لاسکە گیاکانی کێڵگەی ڕۆخی شەقامەکە.
**"ئەی بوگۆتا، پێ لە گەنمەکە مەنێ، مەگەر نازانی ئەم کارە ڕێگەپێدراو نییە."**

نۆنیاز بە بیستنی ئەم هۆشدارییە تەواو سەری سووڕما، چونکە خۆشی هەستی بە دەنگی پێی نەکردبوو.
دوو کەس لە کوێرەکان کە بانگیان دەکرد، بەرەو ڕووی هاتن و نۆنیازیش بە هێواشی پێی هێنایەوە نێو شەقامەکە و گوتی:

**"من لێرەم."**

کوێرەکان پرسییان:

**" کە بانگمان کردی بۆچی نەهاتی، ئایا دەبێت وەك منداڵ ڕەفتارت لەگەڵدا بکەین. کە دەڕۆی، گوێت لە دەنگی پێت نییە؟"**

نۆنیاز پێکەنی، پێکەنینێکی غەمگینانە و گوتی:

**"من دەتوانم ئێرە و هەموو شوێنێکی دیکە ببینم، پێویستم بە بیستنی دەنگی پێم نییە."**

و پیاوە کوێرەکە گوتی:

**"لە دنیای ئێمەدا ئەم قسانە مانایان نییە، کۆتایی بەم قسە گێلانانە بێنە و هەوڵ بدە عاقڵ بیت. بە دوای دەنگی پێمان بکەوە و لەگەڵمان کەوە."**

نۆنیاز لە کاتێکدا کە دەیگوت:

**"نۆرەی منیش دێت، نۆرەی منیش..."**

بە دوایان کەوت.

**"بە دوای ئێمە بکەوە، تۆ زۆر شت هەیە کە دەبێت فێریان بیت."**

نۆنیاز گوتی:

**"ئایا کەس بە ئێوەی نەگوتووە کە لە وڵاتی کەوێران پیاوێکی یەك چاویش دەتوانێت ببێتە پاشا؟"**

و لە کاتێکدا کە ئەوان بە قسەکانی نۆنیاز کەوتبوونە پێکەنین و شانەکانیان بڵیند و نێوی دەبووەوە، گوتیان:

**"کوێرەکان، دنیای کوێرەکان، پاشا، پیاوێکی یەك چاو، هێشتا شێتە، هێشتا..."**

نۆنیاز بە باشی بۆی دەرکەوتبوو کە بارودۆخەکە تا دێت لەوە خراپتر دەبێت کە بتوانێت وێنای بکات و بیهێنێتە پێش چاوی خۆی.

بڕیاری دا لە دەرفەتێکی گونجاودا کودەتایەك ئەنجام بدات و ڕەنگە لەم ڕێگەیەوە سەرکەوتنێك لە مەڕ تێگەیاندنی ڕاستییەکانی زەینی خۆی، بە خەڵکەکە وەدەست بخات. ئەو،

ئەوان بە کاری قورس و تاقەتپڕووکێنەوە ڕۆژی دەکردەوە و ئەو بارودۆخە دژوارەی تەحەمول دەکرد، تەحەمولێکی تاقەتپڕوکێن.

خەڵکی وڵاتی کوێران، ژیانێکی زۆر سادەیان هەبوو. ماندوونەناس و هەوڵدەر بوون.

خاوەن ڕەسەنایەتی و ژیانێکی کۆمەڵایەتی بوون. بە قەدرا پێویستیی خۆیان خواردن و جلوبەرگیان هەبوو. ڕۆژ و وەرز پشوو و کار، ئاوازی گۆرانی و مۆسیقا، عەشق و دلۆڤانی و هەموو و هەموو شتێك کە مرۆڤەکان هەیانبوو، گۆشە و کەناری ژیانی ئەوانی بەرهەڤ دەکرد.

ئەوان وردبینییەکی تەواویان لە کاروبارەکانی ژیانیاندا هەبوو و خاوەن بڕوایەکی پتەو بوون بە خۆیان و بە دوای چارەنووسیاندا ڕێیان تەی دەکرد، وەك ئەوەی کە هەر شتێك سرووشت بۆ ئەوانی دەستەبەر کردووە، بە ئاراستەی ڕازیکردنی نیاز و خواستەکانیان بووە.

لە وڵاتی کوێران، هەموو خەڵکەکە ئامرازی کشتووکاڵیان هەبوو کە بە هێڵی کێشراو و قۆقزی سەریان نیشانەی خاوەنداریەتی هەر کامەیانی دەردەخست. ئامرازگەلێك کە

خەڵکی بە هۆیانەوە زەویان دەکێڵا و قووت و خۆراکیان لێوە پەیدا دەکرد.

خەڵکی وڵاتی کوێران، خەڵکێکی زیرەك و هۆشیار بوون.

ئەوان دەیانتوانی بچووکترین جووڵەی کەسانی دیکە لە دووری دوورەوە هەست و دیاری بکەن و گوێیان لە دەنگی دڵیان بێت و لە کێڵگەکانیاندا کارەکانیان بە لێزانییەکی تایبەتەوە ئەنجام دەدا، هەستێکی بۆنکردنی سەیریان هەبوو، بۆنکردنێك کە بە تەنیایی لە توانایدا هەبوو مرۆڤەکان لە یەکتری جیا بکاتەوە.

لە دەرفەتێکدا، نۆنیاز لە نێو ئاپۆرەی خەڵکەکەدا کەوتە قسە کردن.

هەندێکیان بە ڕووخسارێکی داهێزراوەوە گوێیان بۆ هەڵدەخست.

لە نێوان خەڵکەکەدا، کچێك هەبوو کە چاوەکانی؛ پێڵوو و برژانگێکی درێژەیان هەبوو و بە پێچەوانەوەی خەڵکەکەی دیکەوە لۆچ و قووڵبوونەوەیان پێوە نەدەبینرا.

وا پێدەچوو کە لە بن برژانگە درێژ و جوانەکانییەوە چاوەکانی شاردبێتەوە. کچێك کە هێدی هێدی دەچووە نێو

دڵی نۆنیازەوە. نۆنیاز بە هیوا بوو چاوەکانی ئەویش وەك هی ئەو وابن.

کچەکە، بە حەز و خوولیایەکی تایبەتەوە گوێی بۆ قسەکانی دەگرت و نۆنیازیش تا بەشکوم بتوانێت سەبارەت بە بارودۆخەکەی خۆی ڕازی بکات.

نۆنیاز بە گەرموگوڕی و حەز و لە هەمان کاتیشدا بەو پەڕی سادەیی و بێپەردانە لەبارەی دیمەنی جوان، ئاسمان، درەوشانەوەی خۆر و.. قسەی دەکرد و ئەو کچەکەیش کە ناوی (مدینا) بوو، بە هەموو وجوودییەوە گوێی هەڵدەخست، چێژی وەردەگرت.

هەر چەندی ئەو وشانە واتایەکیان بۆ ئەو نەبوو، بەڵام شاعیرانە و جوان دەردەکەوتن.

یەکێك لە دانیشتوانی وڵاتی کوێران، لە بەرامبەر تێهزرینەکانی نۆنیازدا دەنگی هەڵبڕی و گوتی:

**"بەڕاستی هیچ کێوێك نییە، تەنیا ئەو بەردانەن کە لە نێزیکیانەوە حوشتر و هێسترەکانمان دەلەوەڕێن، شوێنێك کە کۆتایی دنیایە. لە سەرەوەی ئێمە بنمیچێکی ساف هەیە کە شەونم و ئاو دەڕێژێتە خوارەوە و..."**

وێناکردنی دنیا لە شێوەی ئەشکەوتێکدا، وێنایەك بوو کە ڕەنگ و ڕیشەی لە نێو بیروباوەڕەکانیاندا داکوتابوو.

ڕۆژێك پێش لە خۆرئاوابوون، لەو کاتەی کە نۆنیاز لەگەڵ هەندێك لە خەڵکەکەدا لە نێو گۆڕەپانی گوند وەستابوو، پێدرۆی بینی کە لە یەکێك لە ڕێڕەوەکان کە ناویان نابوو شەقامی حەڤدەیەم، بەرەو گۆڕەپانی گوند لە ڕێدا بوو، بەڵام هێشتا کۆڵێك لێوەیان دوور بوو. نۆنیاز هەڵی قۆستەوە و گوتی:

**"وەك بەڵگەی ئەوەی کە لەبارەی دنیای چاوەوە بە ئێوەم گوتووە، پێتان ڕادەگەیەنم کە پێدرۆ بەرەو لای ئێمە دێت."**

یەکێك لە پیرە پیاوەکان گوتی:

**"دەنگی پێی ئەو لە شەقامی حەڤدەمەوەیە، بەڵام ئەو بۆ ئێرە نایەت، چونکە لێرە کارێکی وەهای نییە."**

و پاش ماوەیەکی کەم کە بۆ نۆنیاز چاوەڕوانییەکی درێژ بوو، پێدرۆ ڕێڕەوەکەی خۆی گۆڕی و لە شەقامی ژمارە دەوە بەرەو لای دیوارە بەردینەکان ڕێگەی خۆی خوار کردەوە کە بووە هۆی ئەوەی نۆنیاز بە تەواوی گاڵتەی پێ بکرێت.

دواتر نۆنیاز بڕیاری دا خەڵکی دڵگەرم و هان بدات تا لەگەڵ یەکێك لە ئەندامانی گوندەکە لە داوێنی کێوەکەوە، ئەو شوێنەی کە لە نێوەندی گوندەکەوە زۆر دوور بوو، پێیان بلێت کە خەڵکی چ چالاکییەك ئەنجام دەدەن و بەم شێوەیە توانای وێناکردنی بینین لە زەینی خەڵکەکەدا دروست بکات، بەڵام لە ناکاو بیری کەوتەوە کە ئەو چالاکیيانەی کە شیاوی بیرخستنەوە بن و توانای بینینی ئەو ئاشکرا بکەن، لە کاتی کارکردن و هەوڵ و کۆششەکانی ئەواندایە کە ئەویش لە شەودایە و ڕۆژانە هەموویان پشوو دەدەن.

نۆنیاز کە یەك لە دوای یەك هەموو دەرگاکانی هیوای بە ڕوودا دەبەستران، بڕیای دا دەست بداتە زۆرداری.

بیری کردەوە کە یەکێك لە پێمەڕەکانیان بدزێت و ئەو کارە بکات. بە خۆی گوت:

"ئەگەر بەم پێمەڕە، لە یەك دووانێکیان بدەم و ڕا بکەم، **خەڵکی پەی بە توانایەکی نوێ لە مندا دەبەن و بواری قبوڵکردنی ڕاستییەکان لەواندا هەموار دەبێت."**

بەڵام هەستی بە ئیحساسە نادیارەکەی خۆی کرد، هەستێك کە هۆشداری دەدایێ و پەشیمانی دەکردەوە لە ئازاردانی خەڵکانێك کە نابینا بوون.

نۆنیاز لە دەریای شەپۆلاوی ئەندێشەکانی خۆیدا وەك پاپۆڕێکی سەرلێشێواو، هەروا بڵیند و نیوی دەبووەوە تا لە ناکاو و لەوپەڕی سەرسووڕمانەوە بۆی دەرکەوت کە هەموو خەڵکی لە دیارنەمانی یەکێك لە پێمەڕەکانیان و لە ماوەیەکەی زۆر کورتدا ئاگادار بوونەتەوە و لە کاتێکدا کە گوێیەکانیان بۆ دەوروبەری خۆیاندا قۆڵاخ کردبووەوە، ئاگاداری جووڵەکانی ئەوان بوون کە لە ناکاو یەکێکیان بە هاوارکردنەوە گوتی:

**"ئەو پێمەڕەیە دابنێ."**

و نۆنیاز کە بە بینینی ئەم دیمەنە تووشی سەرسووڕمان و ترس و واقوڕماوی ببوو، خەریك بوو یەکسەر فەرمانەکەی جێبەجێ بکات، بەڵام لە شوێنەکەی هەستا و بە خێرایی لە نێوان کێڵگەیەکدا بەرەو داوێنی شاخەکان ڕایکرد و خەڵکەکەیش کە بە ئاسانی شوێنپێی ئەویان دەدۆزییەوە، لە کاتێکدا کە ئامادەی شەڕ بوون لەگەڵیدا، بەدوای کەوتن.

نۆنیاز پاش بڕینی مەودایەك، بە هێواشی لە گۆشەیەکدا دانیشت. سەیری خەڵکەکەی دەکرد و لەگەڵ خۆیدا بیری کردەوە:

**"شەڕ و خەبات لەگەڵ کەسانێك کە خاوەن بنەمایەکی هزری جیاوازن، ویژدانیانە نییە."**

خەڵکی بە پێمەڕە و گۆپاڵەوە و بە چپەچپکردن و بە چەندین ڕێگەی جیاوازەوە بەرو ڕووی دەهاتن.

کەمێك دەهاتنە پێشەوە و بۆنیان دەکرد و گوێیان هەڵدەخست. سەرەتا کە ئەوان وایان دەکرد نۆنیاز پێکەنی، بەڵام دوای ئەوە ئیتر پێنەکەنی، چوونکە گرووپێك لە خەڵکەکە ڕاستەوخۆ بەرەو ڕووی ئەو دەهاتن و هەر ساتەو نێزیك و نێزیکتر دەبوونەوە.

لە ماوەیەکی کورتدا، گرووپێك لە خەڵکەکە گەیشتنە لای. بە شێوەیەکی بازنەیەکی لە بەرامبەری وەستان و گوێیەکانی خۆیان بەرەو لای قوڵاخ کرد.

نۆنیاز بە هێواشی وەستا و بە توندی دەسکی پێمەڕەکەی گوشی.

ئایا دەبوو هێرشیان بکاتە سەر؟! کەوتەوە بیری سەرەتای کەوتنەخوارەوەی بۆ نێو دۆڵەکە.

**"لە وڵاتی کوێران پیاوێکی یەك چاویش پاشایە."**

نۆنیاز سەیری پشتەسەری خۆی کرد. کەڵەشاخی سەردەئاسمان و لە ڕووبەڕوویشیدا خەڵکێکی تووڕە وەستابوون. گرووپێکی دیکەیش لە ڕێگەدا بوون.

ئایا دەبوو هێرشیان بکاتە سەر؟!

یەکێك لە کوێرەکان هاواری کرد:

**"ئەی بوگۆتا، بوگۆتا لە کوێی؟"**

و نۆنیاز کە هەروا دەسکی پێمەڕەکەی دەگوشی، هەنگاوێك واوەتر چوو.. جووڵەیەکی سەبر، بەڵام وەك ئەوەی دەنگی پێی وەك دەهۆڵێك لە کێوەکاندا دەنگی دابێتەوە.

یەکهۆ خۆی لە گەمارۆی خەڵکەکەدا بینییەوەوە. بە خۆی گوت:

**"ئەگەر منیان گرت، لێیان دەدەم."**

سوێندی خوارد:

**"به خوا، لێیان دەدەم."**

و دواتر لە تێهزرینەکەی هاتە دەرەوە و هاواری کرد:

**"سەیر کەن، من لێرەم. لە نێوانتاندا. لەم دۆڵەدا هەر کارێکم بوێت دەیکەم، ئایا دەبیستن؟ هەر کارێکم بوێت دەیکەم و بۆ هەر شوێنێك بمەوێت دەچم."**

بەڵام بەڕاستی بۆ کوێ؟!

خەڵکی هەروا وردە وردە دەهاتنە پێشەوە و بازنەی گەمارۆکەیان تەنگتر و تەنگتر دەکردەوە.

ڕێك هەر وەك دیمەنی یاری گایێنی کوێران. یەکێك لە کوێرەکان هاواری کرد:

**"دەوری بگرن."**

و نۆنیازیش بە دەنگێی ساف، بەڵام لەرزۆکەوە گوتی:

**"ئێوە تێناگەن، کوێرن و من دەتوانم ببیستم، وازم لێ بێنن، لێم گەڕێن."**

له نێو ئاپۆرەی خەڵکەکەوە دەنگێك بەر گوێ کەوت کە دەیگوت:

**"بوگۆتا، ئەو پێمەرەیە دابنێ و لە کێڵگەکە وەرە دەرەوە."**

فەرمانێکی بێ ئەملا و ئەولا بوو، وەك فەرمانەکانی مرۆڤە شارستانییەکان کە لە هەستێکی پڕ لە تووڕەبوونەوە هەڵقووڵابێت.

لە کاتێکدا نۆنیاز بە وردی سەرنجی خەڵکەکەی دەدا و بە هەستییارییەکی تایبەتەوە هەنسکە هەنسکی بوو، بە دەنگێکی بەرەزە گوتی:

**"لێتان دەدەم، بە خوا لێتان دەدەم، وازم لێ بێنن."**

یەکێك لە کوێرەکان لە بازنەی خەڵکەکە جیا بووەوە و هێرشی کردە سەر نۆنیاز و ئەویش سەرلێشێواوانە لە نێو ئاپۆرەی خەڵکەکەدا بەمبەر و بەولادا ڕای دەکرد.

بە دروستی نەیدەزانی چ بکات، بۆچی حەزی لەوە نەبوو کە لە کەس بدات.

لە ناکاو وەستا..

لەو کاتەی کە خۆی ئامادە کرد و بە هەموو توانایەوە پێمەڕەکەی بە دەوری خۆیدا هەڵدەسووڕاند و دەنگێکی وەك وشەوشەی بای بیابانەکانی دروست دەکرد، خۆی کووتایە نێو ڕیزی خەڵکەکەوە.

دەنگی شکان و هاوارێك بەرز بووەوە و نۆنیاز لە گەمارۆکەیاندا ڕای کرد.

ڕایکرد و دوور کەوتەوە، بەڵێ، وەك باڵندەی ڕزگاربووی نێو قەفەس، بە سەرەولێژی کێوەکەدا دەفڕی و دوور دەکەوتەوە.

بە خێرایی بە نێو کێڵگەکەدا خۆی گەیاندە نێزیك گوندەکە. لە کاتێکدا کە خەڵکی، پێمەڕە و گۆپاڵەکانیان لە دەست دەگوشی و ورتەورتیان دەکرد، بە خێرایی بەمبەر و بەوبەردا ڕایان دەکرد.

نۆنیازیش حاڵێکی گێژیی و سەرلێشێواوی تووش هاتبوو، هەراسان بوو. دەکەوتە سەر زەوییەکەوەو دواتر هەڵدەستایەوە و ئاوڕی دەدایەوە.

بە خێرایی خۆی گەیاندە داوێنە ستوونییەکانی ڕووبەڕووی، بە دەست و پێ ڕای دەکرد، تا ئەو شوێنەی کە هێزی دەبەردا

بوو بە شاخەکەدا هەڵگژا و لە نێزیکی تاشەبەردە ساف و ستوونییەکانی نێو بەردەڵانەکەدا خۆی حەشار دا.

ئۆنیاز بۆ ماوەی دوو شەو و ڕۆژ هەروا لە داوێنی کێوەکە خۆی شاردەوە. نە ڕێگەیەکی گەڕانەوەی بۆ خۆی دەدۆزییەوە، نە ڕێگەیەك بۆ هەڵاتن.

برسیەتی و نەخۆشی تا قووڵایی وجوودی ڕۆچووبوو. جارجارە بە پلارەوە بە خۆی دەگوت:

**"لە وڵاتی کوێران، پیاوێکی یەك چاویش پاشایە."**

ئۆنیاز، گشت ڕێگەکانی ڕووبەڕووبوونەوەی لەگەڵ خەڵکی گوندەکە تاوتوێ کرد، بەڵام هەر جارەی خۆی دە ڕێکورك و بنبەستێکدا دەبینییەوە و ڕێگەیەك نەبوو بۆ هەڵاتن.

دەبوو خۆی بسپێرێتە دەست کارەساتەکان. جار جارە لە تاوی برسیەتیدا، بە نێو دارەکان بە دوای قووت و خواردنێکەوە بوو، بەڵام وا پێدەچوو کە هەموو شتێکی ئەم دۆڵە تۆقێنەرە دەستیان خستبێتە نێو دەستی یەکترییەوە تا سەرلێشێواوییەکەی زیاتر و زیاتر بکەن.

ئەویش سەرسووڕماو لەم چارەنووسەی خۆی و داهاتووە نادیار و تاریکەکەی، هیوا و ئارەزووەکانی هەروەك سەرابێك لە بەر چاوییەوە دەهاتن و دەچوون.

دواجار لە بارودۆخێکدا کە خۆی سپاردبووە دەست شەپۆلەکانی چارەنووس و بڕیاری خۆی دا.

نۆنیاز، بە هێواشی بەرەو خوارەوەی دۆڵەکە، بەرەو لای وڵاتی کوێران کەوتە ڕێ و بە تەنیشت یەکێك لە جۆگەلە ئاوەکاندا شۆڕ بووەوە. کاتێك گەیشتە نێزیکی گوندەکە، بە دەنگێکی بەرز بانگی خەڵکەکەی کرد.

بەوەیش دوو لە کوێرەکان لە خانووەکانیاندا هاتنە دەرەوە و ئامادە بوون بۆ دواهەمین جار گوێ لە قسەکانی بگرن.

نۆنیاز بە بینینی ئەو دوو پیاوە، بەبێ کات بە فیڕۆدان یەکەم وشە گوتی:

**"من، من شێت بووم. ئاخ.. ئاخر تازە لەدایك.. ببووم."**

کوێرەکان بە دەنگێکی نیوە ڕازیبوونەوە گوتیان ئێستا باشترە و نۆنیاز بە بڕوا بە خۆبوونێکی زیاترەوە درێژەی دایێ:

**"ئێستا باشتر بوومە، عاقڵ بوومە و لە قسە و گوتەکانی خۆم پەشیمانم."**

نۆنیاز دەگریا، گریانێك کە هیچ کات دەنگی نەبوو. لە چاوەکانییەوە وەك کانییەکانی داوێنی کێوەکان فرمێسك خلۆر دەبوونەوە، گریانێك کە لە قووڵایی وجوودییەوە دەهاتە دەرێ و ئارەزووەکانی دەشوشتنەوە و هەڵیدەڕشتنە سەر زەوی.

کوێرەکان، قسە و گریانەکانیان بە نیشانەیەك لە چاکسازی و وەسەرڕێکەوتنی فکری ئەو دەزانی و لێیان پرسی ئایا دووبارە لەبارەی بینین، چاو و دنیای خۆیەو قسە دەکاتەوە؟ ئایا دووبارە بیریان لێ دەکاتەوە.

ئەو هەروا کە هەنسکە هەنسکی بوو زو شانەکانی وەك باڵی باڵندەکان بڵیند و نێوی دەبوونەوە، گوتی:

**"نا، هیچ کات. ئەو قسانە گەمژانە بوون کە دەمکردن. ئەو وشانە هیچ مانایەکیان نەبوو، تەنانەت کەمتر لە هیچ. بەڵێ کەمتر لە هیچ."**

لێیان پرسی، چ شتێك لەسەر سەری ئەوەوەیە. ئەویش بێ ماتڵبوون وەڵامی دایەوە:

**"بنمیچێکە کە تەواو ساف و ئاسۆییە و شەونمی لێ دەبارێت."**

لە کاتێکدا کە نۆنیاز بەردەوام دەگریا، گوتی:

**"بەر لەوەی کە پرسیاری دیکەم لێ بپرسن، هەندێك خواردنم بدەنێ، خەریکە لە برسان دەمرم."**

هەر چەندە نۆنیاز چاوەڕوانی سزایەکی توندتر بوو، بەڵام خەڵکی وڵاتی کوێران لێبوردەییەکی زۆریان هەبوو و سەرکێشی و عەجوولایەتییەکەی ئەویان لە گەمژەییەکەیەوە دەزانی، بۆیە بەڵێنیان پێدا کە ئەگەر عاقڵ بێت و قسەی بێبنەمای هەڵقوولاو لە زەینە نەخۆشەکەیەوە نەهێنێتە سەر زمان، کارێکی لەبار و سادەی دەدەنێ تا وەك خەڵکەکە ڕۆژگاری خۆی بەسەر بەرێت.

ئەویش کە ڕێگەیەکی دیکەی شك نەدەبرد، ملکەچانە ددانی بە هەڵەکانی خۆیدا نا و قسەکانی ئەوانی پشتڕاست کردەوە.

بۆ چەند ڕۆژێك نۆنیاز نەخۆشییەكی توندی گرت و خەڵكی بە باشی چاودێرییان كرد، چونكە ئەو ئیتر تا ئاستێك عاقڵ ببوو، بەڵام پێداگری ئەوەیان دەكردەوە كە لە خانوویەك، لە شوێنێك كە تاریكی ڕەها دەستی بەسەردا گرتبێت، پشوو بدات كە ئەوە بۆ ئەو زۆر ناخۆش بوو.

لەم ماوەیەدا، گەورە و فەیلەسووفەكان سەرەڕای سەردانیكردنی، لەبارەی كارە شەڕەنگێزەكانی پێشتریەوە قسەیان لەگەڵیدا كرد و لە بەخشینی ڕێنوێنی و مۆچیاری دریغییان نەدەكرد.

بەم شێوەیە، نۆنیاز وەك یەكێك لە هاوولاتییانی ولاتی كوێران قبوڵ كرا و ئەویش خۆی ناچار كرد بە قبوڵكردنی ئەو دنیا نوێیە.

نۆنیاز هەر وا كە خووی بەو بارودۆخە نوێوەوە دەگرت، تا دەهات دنیای دەرەوە و سەرووی ئەو شاخ و داخانەی لە مێشكیدا بزر و بێرەنگتر دەبوو.

پێشەوای كوێران، نۆنیازی خستە بن دەستی پیاوێك بە ناوی (**یەعقوب**). پیاوێكی دلۆڤان كە ئازار و ئەزیەتی نەدەدا.

لە نێو ماڵیاندا، كوڕە برای یەعقوب و هەروەها كچێكی یەعقوب دەژیان.

کچێکی جەحێڵ کە لە نێو خەڵکیدا ڕێز و شکۆیەکی نەبوو، بەڵام ئەو هەمان ئەو کچە بوو کە هەرچەندی چاوەکانی کوێر بوون و هەمان تایبەتمەندی هاووڵاتییانی وڵاتی کوێرانی هەبوو، بەڵام برژانگێکی درێژی هەبوو و پێڵووە برژانگەدارەکانی سوور و قووڵەوبوو نەبوون.

واپێدەچوو کە ئەو چاوانە، بۆ هەر ساتێك خوازیاری کرانەوە بوون کە ئەمەیش بۆ خەڵکەکە بە عەیبێکی گەورە هەژمار دەکران. بۆیەیش داخوازیکەر و عاشقێکی نەبوو، ئەو هەمان (مدینا) بوو.

بە تێپەڕبوونی کاتەکان، نۆنیاز کەوتە بیری ئەوەی کە ئەگەر بتوانێت لەگەڵ مدینا ژیانی هاوسەری پێك بهێنێت، تێپەڕینی زەمەن کەمتر مەلوول و داماوی دەکات، چونکە بە بڕوای خۆی، مدینا جوانترین مەخلووقی وڵاتی کوێران بوو، کچێك کە زۆرجار سەرنجی چاوەکانی بەرەو لای خۆی ڕادەکێشا.

نۆنیاز بە درێژایی ڕۆژ، لە کاتێکدا کە هەمووان خەریکی پشوودان بوون، لە ژێر ڕووناکی ئەو تیشکەی کە لە درزی دیوارەکانەوە دەهاتە ژوورەوە، سەیری ڕووخساری مدینای دەکرد و ڕۆ دەچووە نێو جوانییەکانییەوە.

شەوێکیان هەردووکیان پاش ئەنجامدانی کاری تاقەتپڕووکێنی کشتوکاڵی، لە بن ڕووناکی ئەستێرەکان و شان بە شانی یەکتری دانیشتبوون.

نۆنیاز بوێری دایە خۆی کە دەست بخاتە سەر شانی مدینا و بە خۆیەوە بوگشێ و مدینایش کە تا ئێستا دەستی دلۆڤانی کەسی هەست پێ نەکردبوو، بە دڵ و حەزەوە هەمان کاری دووبارە کردەوە. هەردووکیان، دوو غەریب بوون کە لە نێوان خەڵکیدا پلەوپایە و ڕێزێکیان نەبوو.

جارجارە دەرفەتێك دەهاتە پێشەوە و لەگەڵ مدینا لە خەڵوەتی خۆیدا دەکەوتە قسە. سەبارەت بە دنیایەکی مەزن و جوانییەکانی، لەمەڕ بریقەدانەوەی قژی کە هەر وەکە ڕووناکی زێڕینی خۆر لە کاتی ڕۆژئاوابووندا دەردەکەوت و..

بەڵام مدینا قسەکانی ئەوی بە وشەی شاعیرانە و هەڵقووڵاو لە عەشقەکەیەوە دەزانی، بۆیە نە باوەڕی بە دنیا گەورەکەی ئەو و نە بە جوانییەکانی دەکرد.

وەها پێدەچوو دنیای بێ کۆتایی ڕاستییەکان بۆ نۆنیازیش وردە وردە لەو دۆڵەدا کۆتاییان پێ دەهات و دنیای بانی ئەو دۆڵە، تەنیا وەك ئەفسانەیەکی لێهاتبوو بۆی.

نۆنیاز سوودی لەو هەلە هەڵکەوتووانەی تەنیا خۆی و مدینا وەردەگرت و هەروا درێژەی بە هەوڵ و کۆششی خۆی دەدا تا دوور لە گوێ تیژ و قۆڵاخەکانی خەڵکی، دنیای چاو و بینین، دنیای ڕاستینی ژیان بۆ ئەو کچە جوانە وەسف بکات.

مدینایش بە وردبینیی تەواوەوە لە بن سێبەری ناسکی دەستپیاهێنانەکانی دەستی نۆنیاز، گوێی بۆ وشەکانی هەڵدەخست و چێژی دەبرد.

بە شێوەیەك کە جاری وا هەبوو هەستی دەکرد مدینا باوەڕ بە هزر و قسەکانی دەکات و تروسکاییەك لە هیوا لە دڵیدا دەدرەوشایەوە، بەڵام هەموو ئەو قسانە بۆ مدینا شتێك نەبوون جگە لە خەیاڵ و پڵاوی شاعیرانە و عاشقانە.

چیرۆکی عەشقی شاراوە و بە نهێنی نۆنیاز و مدینا، تەنیایی و خەڵوەتی ئەوانی بڕی و خوشکە گەورەکەی مدینا، چیرۆکی خۆشەویستیانی بۆ باوکی یەعقوب ئاشکرا کرد.

دژایەتیکردن هەر لە سەرەتای دەستپێکی ڕووداوەکانی ئەو دووەوە دەستی پێ کرد، هەرچەندە زۆر جدیش بەر چاو نەدەکەوتن، بەڵام مدینا کچێك بوو لە ڕوانگەی خەڵك و باوکییەوە لە دەرەوەی توانا و ئایدیالەکانی ژیانی

هاوسەرییەوە بوو و لە ڕوانگەی خەڵکەوە شیاوی ئەوە نەبوو کە شوو بە هیچ پیاوێکی وڵاتی کوێران بکات.

یەعقووب هەستێکی بەزەییانەی تایبەتی بە هەردووکیان واتە مدینا و نۆنیاز هەبوو، چونکە نۆنیاز لاوژ و دەبەنگێك بوو کە بە تازەیی هەندێك وە هۆش و ئاوەز خۆی هاتبووەوە و ڕابردوویەکی باشیشی نەبوو. مدینای کچیشی پێڵوو و برژانگێکی درێژی هەبوو.

لە لایەکی دیکەیشەوە ئەو نەیدەویست شاهیدی گریانی ڕۆژانەی کچەکەی بێت و دژایەتی پێکەوەژیانی ئەوانی نەکرد.

پیاوە جەحێڵەکان کەم و زۆر بە بیستنی ئەم هەواڵە تووڕە بوون و ژیانی هاوسەری ئەوانیان بە سەرچاوەی تێکچوونی نەوەی خۆیان دەزانی.

زۆر جاران یەعقوب مدینای کچی مۆچیاری دەکرد:

**"کچم، تۆ دەزانی کە ئەو لە گەمژەیەك زێتر نییە. بیر و خواستی پووچانەی هەیە، ناتوانێت هیچ کارێك بە ڕاستی ئەنجام بدات. ئەو لەدایکبووی بەردەکانە و.."**

لە کاتێکدا کە مدینا دەگریا، گوتی:

**"دەزانم باوکە، بەڵام وردە وردە باشتر دەبێت.. لە ڕابردوو باشتر بووە. پیاوێکی بەهێز و دڵفڕانە، بەهێزتر و دڵفڕانتر لە هەموو پیاوانی دونیا. ئەو عاشقی منە و منیش عاشقی ئەوم."**

یەعقووبی پیریش لەوەی کە بارودۆخی عاشقانە و سووکنایینەهاتووی دواهەمین کچی دەبینی، زۆر پەرێشان و غەمبار بوو.

دەیبینی کە ئەو بە هەموو وجوودییەوە نۆنیازی خۆش دەوێت و عاشقیەتی، هەر بۆیە بەرەو دیوەخانە بێ پەنجەرە و تاریکەکەی ئەنجوومەنی وڵاتەکەی کەوتە ڕێ تا هاوڕا لەگەڵ گەورەکاندا مەڵهەمێك بۆ برینەکانی بدۆزێتەوە.

گەورە، پێشوا و پیرانی گوند هەموو ئامادە بوون.

یەعقوب بە وردییەوە چیرۆکی عەشقی نۆنیاز و کچەکەی بۆیان گێڕایەوە و باسی ئەوە کرد کە نۆنیاز پیاوێکی عاقڵبوو و تەنانەت هەندێك جاریش لە ساغڵەمی ئاوەزیدا وەك خۆیانە.

یەعقوب هەوڵی زۆری دا تا گەورەکان بۆ پێکهێنانی ژیانی هاوسەری ئەو دووانە ڕازی بکات.

گەورەکان کەوتنە ڕاوێژ، یەکێکیان ڕۆچووە نێو بیرکردنەوە و تێهزرینێکی زۆرەوە.

ئەو ڕوانگەیەکی تایبەتی هەبوو. دوکتۆرێکی گەورەی نێو خەڵکەکە بوو و خاوەن زەینێکی فەلسەفی و داهێنەر بوو.

لە ڕوانگەی دوکتۆرەوە، بەر لە بڕیاردان دەبوو نۆنیاز لە ڕووی پزیشکییەوە بە تەواوی نۆرین و هەڵسەنگاندنی بۆ بکرێت تا هۆکاری بەلارێداچوونی بیرکردنەوەکەی دیاری بکرێت.

ماوەیەك تێپەڕی و لەم ماوەیەدا بە پێی بڕیاری پێشوو، دوکتۆر نۆرینی بۆ نۆنیاز کرد و ڕۆژێکی دواتر لە هەمان ئەنجوومەنی وڵات بە ئامادەبوونی گەورەکان و یەعقوب دەرەنجامی وردی خۆی بەم شێوەیە باس کرد:

**"من بوگۆتام پشکنی و هۆکاری نەخۆشییەکەیم بۆ ڕوون بووەوە. لەسەر ئەو بڕوایەم کە دەبێت، نۆنیاز دەرمان و چارەسەر بکرێت. بە ئاسانی دەکرێت چارەسەری بۆ بکرێت و باشتر بێت."**

و یەعقوب کە بە هیوا و خواستێکی زۆرەوە گوێی بۆ ڕێگەچارەسەری دوکتۆر هەڵخستبوو، بە حەپەساوی و پەشۆکاوییەوە پرسی:

**"و ئەو بە ڕاستی چاك دەبێتەوە؟! و ئای ئەمە شتێكە كە من هەموو دەم ئارەزووم بووە."**

دوكتۆر درێژەی دایێ:

**"مێشكی نەخۆشە."**

و گەورەكان لە كاتێكدا ئاماژەیان بۆ سەلكیان دەكرد، قسەكانیان پشتڕاست كردەوە و پرسییان:

**"باشە چی بووەتە هۆی بەلاڕێداچوونی مێشكی؟"**

و یەعقوب كە تەواو چاوەڕوانی بیستنی قسەكانی دوكتۆر بوو، گوتی:

**"ب.. بەڵێ دوكتۆر، هۆكارەكەی چییە؟"**

دوكتۆر درێژەی دایێ:

**"هۆكاری نەخۆشییەكەی، لوویەكی سەیرە لە ڕووخساریدا كە ناویان چاوە. ئەو دوو شتە نەرمەیی كە بە شێوەی قۆپاوییەك لە ڕووخساریدان، و ئیتر ئەم لووانە كاریگەرییان لەسەر مێشكی داناوە و نەخۆشیان خستووە."**

یەعقوب بە هەیەجانێکی تایبەتەوە پرسی:

"بەڵێ؟"

و دوکتۆریش بە وشەی قەڵەمی و ژمێردراوەوە، لەسەرەخۆ گوتی:

**"و وابزانم بۆ ئەوەی هەمیشە چاك بێتەوە، دەبێت نەشتەرگەرییەکی سادە و ئاسانی بۆ ئەنجام بدرێت، ئەویش بە هەڵگرتن و لابردنی ئەو ئەندامە ئازاردەرانە."**

**"و.. و دواتر ئەو، ئەو عاقڵ دەبێت؟"**

و دوکتۆر درێژەی دایێ:

**".. و ئەو پاش نەشتەرگەرییەکە عاقڵ دەبێت و دەبێتە یەکێك لە دانیشتووە باش و خوازراوەکانی ئێرە."**

لە کاتێکدا یەعقوب کە شوکر و سوپاسی یەزدانی دەکرد، دەست و پێی خۆی بە بیستنی ئەم هەواڵە خۆشە ون کرد و

خێرا خۆی گەیاندەماڵەوە و بە وردی ڕووداوی چارەسەرکردنی نۆنیازی بۆ ئەو و مدینا گێڕایەوە.
بیستنی ئەم هەواڵە بۆ مدینا زۆر دڵخۆشکەرانە بوو، بەڵام نۆنیازی تووشی شۆکێکی لەناکاو و قووڵ کردەوە و تووشی گۆڕانێکی سەیر، وەك زەویهەژانێك کە هەموو ئەندامەکانی جەستەی هەژاند. یەعقوب کە پەی بە بارودۆخۆی نۆنیاز بردبوو، گوتی:
**"ڕەنگە کەسانی دیکە وا بیر بکەنەوە کە پێکهێنانی ژیانی هاوسەریت لەگەڵ کچەکەم مدینادا هێندە بۆ گرنگ نەبێت و هێندەی کە نیشانت دەدا خۆشت نەوێت؟! سەرەڕای ئەوەیش تۆ چ جۆرە جانەوەرێکی کە لە یارمەتی و دلۆڤانی دوکتۆر ڕا دەکەی؟"**

قەیرانێکی سەرسووڕهێنەری نوێ ڕووخساری خۆی بۆ نۆنیاز دەرخستبوو.. لە دەستدانی چاوەکانی و ژیانی یەکسان لە نێو خەڵکی و یا.. و یا.. و یا هیچ.
هیچ ڕێگەیەکی دیکەی بە مێشکیدا ختووری نەدەکرد.
نۆنیاز هەروا واقی وڕمابوو وەك ئەوەی لەش و گیانی لێك جیا ببوونەوە.

دەرگاکانی ئاسمان وەك ڕۆچنە و بینینی چاوەکانی خەڵکی، بە ڕوویدا کوێرببوونەوە و لە لایەکی دیکەیشەوە مدینا، ئەو کچە خۆشەویستەی کە هەڵی دەنا و چووبووە کەوڵیەوە کە تەنیا ئەو ڕێی ڕزگارییە هەڵبژێریت.

نۆنیاز بە سەرسووڕمانەوە سەیری کچەکەی دەکرد و لە ژێر لێوەوە بە کۆڵ و کەسەرەوە دەیگوت:

**"تۆ منت خۆش ناوێت؟! غەمبار نابی لەوەی کە چاوەکانم بێننە دەرەوە؟! لەوەی کە ڕووخساری جوانی تۆ نەبینم..."**

و مدینا بە بیستنی قسەکانی نۆنیاز، هەستی بە ڕەنجاوی دەکرد و بە حەسرەتەوە سەری خۆی دەلەقاند.

نۆنیاز لە کاتێکدا کە سەری خۆی داخستبوو، درێژەی دایێ:

**"هەموو دنیای من لە چاوەکانمدا کورت دەبێتەوە. ئەم هەموو جوانییەی کە من دەیبینم و دەوری ئێمەیان داوە، گوڵە تەڕ وپاراو و ڕەنگاوڕەنگەکانی نێوان گاشەبەردەکان، جوانی و پاراوی قەوزەکانی نێو شەپۆلەکانی ئاو، زوڵاڵی کانیاوەکان، ئاسمان.. ئاسمانی شین و پڕ لە ئەستێرە، ڕۆژئاوابوونی خۆر بە تیشکە زێڕینەکانییەوە، درەوشانەوەی ئەستێرەکان لە شەوی ئەنگوستەچاودا، و لە لایەکی دیکەیشەوە تۆ.. تۆیەك**

که بۆ دیتنت پێویستم به چاوه تا بتوانم ڕووخساری جوانت ببینم..

لێوه جوانەکانت، دەسته خۆشەویستەکانت که بەسەر یەکەوه قەدیان گرتووه.

من له ڕۆچنەی چاوەکانمەوه تۆم به جوانی بینیوه، جوانییەك که خەڵکی دیکه به ناشیرینی له قەڵەم دەدەن و.. و پاش لەوه دەبێت تەنیا لەمس و دەستت لێ دەدەم، بۆنت بکەم و هیچ کات نەتبینم. ئیتر ئەو دەمەیه که دەبێت منیش بکەومه ژێر ئەو بنمیچه بەردینەی که ئێوه له دنیای خۆتاندا چێتان کردووه و.. نا.. تۆ من ناچار بەم کاره ناکەی، نا دەزانم، نا..."

گومانێکی قووڵ له وجودی نۆنیازدا کڵپەی دەسەند، بەلام وەڵامێکی سەراڤکی و ئاشکرای بۆ مدینا پێ نەبوو تا بیداتەوه. مدیناش چرکەساتەکانی به دژواری به سەر دەبرد..

چاوەڕوانییەکی سەخت و تاقەتپڕووکێن.

"من دەمەوێت هەندێك کات.."

و وەستانێکی کورت. نۆنیاز پرسی:

**"بەڵێ؟ تۆ دەتەوێت..؟"**

"من دەمەوێت هەندێك جار، هەندێك جار بەم شێوەیە قسە نەکەی."

**"وەك چی؟"**

و مدینا درێژەی دایێ:

**"من دەزانم قسەکانی تۆ جوانن، شاعیرانەن، عاشقانەن، بەڵام هەموویان زادەی وێنا و خەیاڵەکانتن. من عاشقیانم، خۆشم دەوێن، هەر وەك ئەوەی کە تۆیشم خۆش دەوێت، من..."**

و نۆنیاز بە دەنگی پچڕپچڕەوە وەڵامی دایەوە:

**"مەبەستی ئێوە، ئێوە وا بیر دەکەنەوە، من دەبێت باشتر بم، ڕەنگە باشتر..."**

ئەو بە باشی درکی بە چاوەڕوانییەکانی مدینا و هەموو دانیشتوانی ئەو دۆڵە لەبیرکراوە دەکرد، بەڵام زۆریشی بۆ پڕ لە کێشە و ناهەموار بوو.

له چارەنووسی لێڵ و تاریکی خۆیدا، وەك ئاگرێکی بێڕەحم غەم و خەفەت هەموو وجوودی دەسووتاند و جارجارەیش فرمێسك بە چاوەکانییەوە دەبارینە خوارەوە، ئەو فرمێسکانەی کە خۆڵەمێشی وجوودی بوون، بەڵام لە هەمان کاتیشدا بە باشی درکی بە مدینا دەکرد.

لە کاتێکدا کە نۆنیاز دەستەکانی بە هێواشی بەرەو لای شانەکانی مدینا بەرز کردەوە، گوتی:

**"خۆشەویستەکەم، خۆ..."**

بەڵام قسەیەکی بۆ گوتن پێ نەبوو، لە باوەشی گرت، بە خۆیەوە گوشی و بە ئەسپاییەوە لە گۆشەیەکی ژوورەکەدا لە تەنیشت یەکترییەوە دانیشتن.

پاش تێپەڕینی ماوەیەك کە چاوەڕوانییەکی دژوار بوو بۆ هەردووکیان، نۆنیاز بە دەنگێکی هێواش، دەمی لێك کردەوە و گوتی:

**"ئایا، ئایا ئەگەر، ئەگەر پێی.."**

و پاش بێدەنگییەکی کورت درێژەی دایێ:

**"ئەگەر پێی ڕازی بم..."**

مدينا وەك سپرينگێك كە لە بن تاشەبەردی خەياڵييەوە بێت، لە شوێنی خۆی ڕاپەڕی.

دەستەكانی بە دەوری نۆنيازدا ئەڵقە كرد و لە كاتێكدا كە هەنسكە هەنسك فرمێسكی شادی دەباراند و ماچی دەكرد، گوتی:

**"ئەگەر تۆ، ئەگەر تۆ تەنيا.."**

لە كاتێكدا كە تەنيا يەك حەوتوو بۆ كاتی نەشتەرگەرييەكە و هێنانەدەرەوەی چاوەكانی مابوو.

نۆنياز، بە پێچەوانەی خەڵكەوە كە لە خەوێكی قووڵدا بوون، هەموو ڕۆژەكەی بيری دەكردەوە و ساتێكيش خەو نەدەچووە چاوەكانی.

لەگەڵ خۆيدا بيری دەكردەوە و ڕۆ دەچووە نێو سەرسووڕمانێكی بێبەهرەوە، حەزی لێ بوو ڕێگەيەك بۆ خۆی هەڵبژێرێت، بەڵام..

دواهەمين ڕۆژ و دەرفەتەكان بە خێرايی تێدەپەڕين. ڕووناكييە زێڕينەكەی خۆر، فۆرمێكی تايبەتی پێ نيشان دەدا.

وەها پێدەچوو کە هێورتر لە ڕۆژانی پێشوو، بە دیوارە بەردەلانییەکاندا سەردەکەوت، وەك بڵەی ماڵئاوایی لەگەڵ نۆنیازدا دەکات، ماڵئاواییەك بە پانتایی ئەبەدییەت.
زەمەن تێدەپەڕی و ساتی بەڵێندراو نێزیکتر و نێزیکتر دەبووەوە.
**"ئیتر سبەی نابینم، ئیتر نابینم، و ئیتر..."**

و لە کاتێکدا کە مدینا دەستەکانی نۆنیازی بە گەرمی دەگوشی، گوتی:
**"دڵدارەکەم، ئەوان ئازارێکی زۆرت پێ ناگەیەنن. تۆ ئەم ئازارە بۆ ساغڵەم و عەشقەکەت تەحەمول بکە.**
**عەزیزەکەم، ئەگەر بتوانرێت بە قوربانیدانی عەشق و دڵۆڤانی، تەحەمولی ئازارەکەی تۆ قەرەبوو بکرێتەوە، ئەوا من بە هەموو وجوودمەوە عەشق و دڵۆڤانی خۆم دەڕێژمە بەر پێتەوە. بەر پێت، بەر پێی تۆ کە دڵۆڤانی و میهرەبانی لە کەلام و قسەکانتدا شەپۆل دەدا."**

نۆنیاز، بە دڵ و بە گیان دەنگە عاشقانەکەی مدینای دەبیست و وەك مراوییەکی بریندار لە دەریای شەپۆلاوی تێهزرینیدا،

حەسرەت و داخداری بۆ خۆی و مدینا هەڵدەکێشا. بە ورتەورتەوە بە خۆی دەگوت:

**"ماڵئاوا چاوەکانم، ئەی بینایی، ئەی ژیانی من، ماڵئاوا."**

مدینا، بە باشی دەیتوانی ئیحساس بە گومان و ڕاڕاییەکانی تۆنیاز لە دەنگی هێواشی پێیەکانییەوە بکات کە بۆ دواوە و پێشەوە پیاسەی دەکرد، ئیحساسێك کە وای لێ کرد بگریت.

تۆنیاز، حەزی لێبوو بچێتە کونجێکی خەڵوەت و تەنیاییەوە، شوێنێك لە نێو کێڵگە جوانەکان، ئەو شوێنەی کە بە گوڵە نێرگزی سپی تەنرابوو و لەوێ لە چاوەڕوانی گەیشتنی ساتی بەڵێنیدراو بێت بۆ پێخستنە نێو کوشتارگەی داماوی و عەشقەوە، بەڵام هەر وا کە ڕێی تەی دەکرد، چاوەکانی بڕییە سەرەوە.

سپێدەدەمی بینی، سپێدەدەمێك کە وەك فریشتەکان لە کراسێکی زێڕیندا بە سەرەولێژیی تەپۆڵکە و شاخەکانەوە بەرەو خوارەوە شۆڕ دەبووەوە.

بە بیریدا هات کە شکۆ و جوانی دۆڵەکە، دنیای کوێرەکان، عەشقی ئەو، و هەموو و هەموو شتێك بۆ ئەوەی لە سیاچاڵێك و لە گوناهێك زیاتر نەبوو.

لە کاتێکدا کە نۆنیاز چاوی بڕیبووە خۆر و سەیری لووتکە بەرزەکانی کێوەکانی دەکرد، بە لارەلار ڕێگەی داوێنی کێوەکەی گرتە پێش.

هەر وا کە دەچووە پێشەوە، وێنا و خەیاڵەکانی لە هەڵدێرگە سەر لە ئاسمان کێشراوەکان و دیوارە بەردینە ستوونییەکانەوە فڕی و لە دنیای وڵاتی کوێران ڕۆیشت، ڕۆیشت و چووە نێو دنیایەکی دیکەوە.

دنیایەك کە هی ئەو بوو، بوگۆتا، شوێنێك کە هەزاران دیمەنی جوان و سەرنجڕاکێش لە هەر گۆشەیەکییەوە چاوی بەرەو خۆی پەلکێش دەکرد.

شکۆ و جوانی ڕۆژەکانی، پەیکەرەکان، قەڵوەز و تاقگەکان، خانووە چەرموگەکان، سەفەر بە سەر ڕووبارەکاندا و نەغمەی بولبولەکانی سەر دارەکان و ڕۆخی ڕووبارەکانی بە بیر دەهێنایەوە.

سەفەرێکی درێژ بە ڕووبارەکانی بوگۆتا، سەفەری ڕۆژ لە دوای ڕۆژ بۆ شارە گەورە و بچووکان بۆ گوندەکان، دارستانەکان، تا ئەو شوێنەی کە ڕووبارەکان یەکیان دەگرتەوە و لەم یەکگرتنەوەیش ئاوازی شادی سەر هەڵدەدا و دەگەیشتنە دەریا، دەریایەکی بێ کۆتا، لەگەڵ هەزاران

دوورگەی بچووك و گەورە، لەگەڵ پاپۆرگەلێك كە لە دوورەوە دەبینران، دنیایەك كە كێوەكان گەمارۆیان نەداوە، دنیایەك كە ئاسمانە شینەكەی بە ڕوونی دەبینرا، ئاسمانێك كە هەزاران گەوهەر لە شەوەكانیدا دەدرەوشایەوە و..

نۆنیاز كەمێك بە خۆیدا هاتەوە، وەستا و سەیرێكی خوارەوەی دۆڵەكەی كرد. لە داوێنی ئەو كێوە بەرزانەوە، مدینا زۆر بچووك دەكەوتە پێش چاوان.

نۆنیاز، بە هەوڵ و كۆشش و بە هەموو هێزێك كە لە جەستەیدا هەبوو، بەرەو دیوارە بەردینە گەورەكان سەركەوت. وەك مارێك، پەیكەرە لەڕ و لاوازەكەی خۆی بە بەردەكاندا دەساوی و سەر دەكەوت.

بە نێزیكبوونەوە لە ڕۆژئاوابوون، هەوڵی نۆنیازیش وردە وردە ئاوا دەبوو. ئیتر ئێستا ئەو لە چاو خوارەوەی دۆڵەكە، مەودایەكی زۆری بڕیبوو و گەیشتبووە نێزیك دیوارە ستوونییەكان.

ئەو دیوارانەی كە توانای تێپەڕبوونی لێیان نەبوو.

جلەكانی دڕابوون، جەستەی بریندار و هەروەك كانیاوەكانی دۆڵی ولاتی كوێران لە برینەكانییەوە خوێن دەچۆڕایە خوارەوە، هەڵقوولاوێكی گەرم و تازەی هەبوو.

بەڵام سەرەڕای ئازار و ئێش و برسیەتی و تینوویەتی، لە کاتێکدا کە زەردەخەنەیەکی بە لێوەوە بوو، بە هیواشی لە دڵی بەردەکاندا درێژ بوو.

نۆنیاز بە دژوارییەوە گەردەنی وەرسووڕاند، سەیرێکی خوارەوەی دۆڵەکەی کرد. وا پێدەچوو تا خوارەوە دۆڵەکە، ئەو شوێنەی کە مدینا چاوەڕوانی بوو، زیاتر لە میلێك قووڵایی هەبوو و ئاوابوونی خۆر و تەمی ڕەش، تاریکییەکەی زیاتر کردبوو، تاریکییەك کە سێبەرێکی نهێناوی لە دەروونیدا مەڵاس دابوو و.. و بە سەر سەریشییەوە ئاسمانێکی بێسنوور.

نۆنیاز لەوە زیاتر توانای سەیرکردنی دیمەنی ئەو دۆڵە نادیارە و دیوارە بەردینەکانی نەبوو، بۆیە تەواو بێ جووڵە و هێواش سرەوت، سرەوت هەروەك ئەو بزەیەی کە لەسەر لێوی بوو.

دواهەمین تیشکەکانی خۆر، بە دیوارە بەردینەکانەوە خۆیان هەڵدەکێشایە سەرەوە و شەو دادەهات. خەڵکی وڵاتی کوێران دەستیان کردبووە کار و کۆششەکانی خۆیان، دوکتۆری گەورە چاوەڕوانی چارەسەرکردنی نۆنیاز بوو.

ئەویش ئارام لە بن ئەستێرەکانی ئاسماندا دڵخۆش و ڕازی خەوتبوو. خەوتبوو و هەروا بزەکەی بە سەر لێوانەوە بوو.

بەڵێ بزەیەکی جاویدان، بزەیەك کە هیچ کات لە سەر لێوەکانی ون نەبوو.

کۆتایی

PM ١:٠٥
SAT, 21 JUL 2012
هەولێر - گەڕەکی ژیان